# وشەی پرشنگدار

لەنێوان ئەو کەسانەی باوەڕیان بە گەلەکانیان و بەدەستەڵات لەسەر خاکەکانیان هەیەو لەنێوان ئەو کەسانەی کە بە خواستی خۆیان کلیلی ئەم شتانە دەدەنە دەستی بیگانە . لەوانەیە زۆربەتان مێژووی عەرەبی موسوڵمانتان خوێندبێتەوە وبێتەوە یادتان کەیەکێك بەناوی ابو رغاڵی یەکەم خاینەوە هەیە ، خیانەتکاریش کارێکە ڕەت دەکرێتەوە ، تەنیا یەك کەس لە هەموو خەڵکی جزیرە بووبە ڕابەر بۆ سوپای ئەبرەهە بەرەو مەککە لەو کاتەوە واتە پێش سەرهەڵدانی ئیسلام بەخاین دانرا ئیسلامەتیش سەری هەڵدا تا ئەم شتە بە داڕشتنێکی پترقووڵو پترفراوان دووپات بکاتەوە .

لەبەر ئەم هۆیەیشە ئێمە پێمان ناخۆشە کە چەند فەرمانڕەوایەکی عەرەب هەن هەرچەندە کەمیشن ، بەتەئکیدیش ئەوان لەکاتێکدا زیان بە تێکڕای عەرەب دەگەیەنن کەچی ئەو زیانەی بەخۆیانی دەگەیەنن زۆر گەورەتر دەبێت باوەڕیش ناکەم گەلی عەرەب لەم جۆرە فەرمانڕەوایانە ئوقرە بگرێت . تکام وایە لێمان نەگرن و باوەڕیش ناکەم ئێوە ئوقرە بگرن و باوەڕیش ناکەم ئەمە قبووڵ بکەن ، بڕیارەکان دەربڕینی هەڵویستی فەرمانڕەوا عەرەبەکان نی‌یە کە لەسەر بڕیارەکانی بەغدا یەکیان گرتەوە بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو وێنەیەی فەرمانڕەوای میسر تێی‌هەڵخلیسکا بەڵکوو ویژدانی نەتەوە دەردەبڕن ، لەوانەیشە نەتەوە داوای سزادانی پتر بکات بەڵام نزمترین ڕادە کە لەسەری یەکمانگرتەوە ڕادەیەکی ماقووڵە ، بەڵام ئەوەی لە توانایدایە شتەکان بەشێوەیەکی پترو باڵاتر دەربڕێت لە سەریەتی بیکات .

**هاوڕێ صدام حسێن**

## لەم ژمارەیەدا




روشنبیری نوێ

بلاوکراوەیەکی ئەدەبیی ڕۆشنبیرییە دەزگای ڕۆشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردی دەری دەکات

ناونیشان : دار الثقافة والنشر الكردية - ساحة الملاني - بغداد

تەلەفون : ٨٨٧٥٧٩٥ پینج خەتە

سەرپەرشتکاری گشتی

سعاد ادیب علی



# دەقی وتارەکەی هاوڕێ صدام حسین لە کۆبونەوەی مەکتەبی راپەراندنی یەکێتی گشتی نیقابەکانی کرێکاراندا

بەڕێز صدام حسین جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش رای گەیاند کە سەرکردایەتی بڕیاری داوە دەست بە هەڵبژاردنی گشتی بکرێ بۆ تێکرای گەلی عێراق ، بۆ ئەوەی ئەنجومەنی ناوەندی نوێنەرانی گەل بێتە کایەوە .

جێگری بەڕێز ئەم قسانەی لە کاتێکدا کرد کە لە کۆبوونەوەی مەکتەبی راپەڕاندنی یەکێتی گشتی نیقابەکانی کرێکاراندا بەشداربوو کە ٢٥-١-١٩٧٩ لە بارەگای یەکێتی بەسترا بۆ لێکۆڵینەوە ئەو راپۆرتەی کە یەکێتی بۆ خولی پانزەهەمینی ئەنجومەنی مەرکەزی یەکێتی ئامادەی کردبوو .

ئەمەش دەقی وتەکەی جێگری بەڕێزە :

لە هەر بۆنەیەکدا کە لەگەڵ ئەم جۆرە دەستە خێرخوازە لە کوڕو کاڵانی گەلو نیشتمان ، لە رۆڵە تێکۆشەرەکانی گەلە مەزنەکەماندا بەیەك دەگەین ، ئەو راستی‌یە دووپات دەبێتەوە کە دەبێ رێز لە پەیوەندیی دیموکراتیانەی نێوان سەرەوەو خوارەوە لە کاربەدەستیدا بە هەموو شێوەکانیەوە بنرێ ، هەروەکو لە کارکردندا راستی‌و پێویستی ئەم جۆرە پەیوەندیی‌یە دووپات دەبێتەوە لە پاڵ راستی‌و پێویستی‌یەکەیدا لە رووی مەبدەئی‌یەوە . ئەمەش وامان لێدەکا کە قەت دەست بەرداری دیموکراتیەت نەبین‌بەر لەمەو رۆژ لە دوای رۆژ ئەوەشمان دووپات دەبێتەوە کە لە کاتێکدا ئێوە دوای دەرس داداناتان لە سەرکردایەتی دەگەن ، وەختێك لەگەڵ ئێوەو کەسانی وەك ئێوەدا بەیەك دەگەین ، ئەویش لە لای خۆیەوە دەرس لە ئێوەوە وەردەگرێ ، سا چ لە رووی کردارەوەبێ کە لە رووی تیوری‌یەوە بە سەر فیکردا رەنگ‌دەداتەوە یا لە کۆڕی، ئەو نموونە زیندووانەدا کە بە کردار پێشکەشی دەکەن‌و کە بە بێ ئەو ، فیکر لە جێ‌بەجێ‌کردندا راست‌و دروست نابێ‌و هەروەها نەخشەدانانیش‌و دروستی ناچێتە سەر .

هەروەها رۆژ لەدوای رۆژو لە هەر بۆنەیەکداکە لەگەڵ ئەم جۆرە دەستەیەدا بەیەك دەگەین کلۆڵی ئەو کەسانەمان بۆ دەردەکەوێ کە باوەڕیان بە پەیوەندیی‌یە زیندووەکانی نێوان سەرەوەو خوارەوە نیەو ئەوەمان لا ساغ دەبێتەوە کە ئەوانە بە هۆی باوەڕنەبوونیانەوە بەم جۆرە پەیوەندیی‌یەو بە جێ‌بەجێ‌کردنی ، خۆیان

لە گەڵی دەرفەت سودبەخش بێبەش دەکەن ، بگرە بۆیان ساغ دەبێتەوە کە ئەوە یەکێکە لە هۆیە سەرەکی یەکانی سەرنەکەوتنی شۆڕشەنیشتمانی و دیموکراتی یەکان لەوڵاتانی جیهانی سێیەمداولەگەڵیدا ڕاستیی پڕۆ گرامی حزبەکەتان دەردەکەوێ کە مەسەلەی دیموکراتیەت نەك تەنیا دەکاتە یەکێ لە ئامانجە ناوەندی یەکانی ، بەڵکوو دەیکاتە هۆیەکی شۆڕشگێڕانەی ئەوتۆ کە لە پێناوی بنیاتنانی شوڕشگێرانەی ئەوتۆ کە لە پێناوی بنیاتنانی کۆمەڵگایەکدا کە حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست سەرکردایەتی دەکا ، بەرپادەکرێ .

من بەش بە حاڵی خۆم زۆر دڵخۆشم نەك لەبەر ئەوەی ئەو هاوڕێیانەی کە قسەیان کرد لە رادەیەکی باڵای تێگەیشتنێکی تەکنیکی و زانستی یانەدا بوون سەباردت بە پێویستی یەکانی سەرخستنی کاری بەرهەمهێنان لە رووی چەندەکی و چۆنەکی یەوە بەو شێوەیەی کە ناوەرۆکێکی زیندووی عەمەلی بداتە مانای خۆشگوزەرانی لە کۆمەڵدا بە ریگای چەسپاندنی بیروباوەڕەکانی حزبەکەتاندا حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست ، دەڵێم نەك تەنیا لەبەر ئەمە بەڵکوولەبەر هۆیەکی تریشە کە لە نێوان گفتوگۆو دەمەتەقێی هاوڕێیانەوە بۆم دەرکەوت کە ئەویش ئەوەیە کاتێ دەمانەوێ هەڵەیەك راستبکەینەوە دەبێ لە خۆمانەوە دەستپێبکەین .

لە بەیەك گەیشتنیکماندا لەگەڵ خوشکان و هاوڕێیانی یەکێتی ئافرەتانی سوریاو عیراقدا پێش دوو رۆژ ، پێم ، وتن ، هەر مرۆڤێك لە سەرکردایەتی سیاسی باڵاداو 'ەهەر کۆڕێك لە کۆڕەکانی بزوتنەوەی کۆمەڵ و دەوڵەتدا کاتێ کە نارێکی یەك لە خوارخۆیەوە دەبینێ .. دەبێ لەناو ئەو کۆرانەو لە شوێنە باڵاکاندا بۆی بگەڕێ .

وەختێك ناڕەکاری یەك لە حزبدا دەبینین ' دەبێ لەناو سەرکردەکانیدا بەدوای کەمو کورتی یەکدا بگەڕێین. کاتێك نا ڕێکی یەك لە بیروباوەڕی کۆمەڵایەتیدا سەبارەت بەمولکیەت دەبینین پێویستە لە شوێنە باڵاکاندا بەدوای کەمو کورتی یەکدا بگەڕێین .. کاتێ نارێکی یەك لە کارکردندا لە کارگەیەکدا دەبینین ، دەبێ لەشوێنێکی سەروو ئەودا بەدوای کەموکورتیدا بگەڕێین .. واتە دەبێ لە خۆوە دەست پێبکەین .. سەرکردایەتی باڵا کاتێ نارێکی یەك لەناو کۆمەڵ و لەناو بیرو باوەڕو کۆمەڵایەتی یەکاندا دەبینێ . دەبێ لە خۆیەوە دەست پێبکا . دەبێ لەخۆی بپرسێ ئە مەسئولیەتی بەرامبەر بەو نارێکی یە چی یە . نیقابە کاتێ نارێکی یەك لە شوێنی کارکردندا دەبینێ لیژنە نیقابی یەکە دەبێ لە خۆیەوە دەست پێبکاو لە خۆی بپرسێ کە مەسئولیەتی لەعاستی ئەو کەمتەرخەمی یەدا چی یە ، سا مەسئولیەتەکە لەو کەمتەرخەمی یەدا لە نەکردنی کارێکدابێ یاکردنی کارێك بەشێوەیەکی چەوت و ، ئەمانە هەردووکیان هەر کەمتەرخەمین . وەختێك مەسئولیەت ناگیرێتە ئەستۆ کەمتەرخەمی روودەدا ، وەختێکیش مەسئولیەت بەشێوەیەکی چەوت جێبەجێ دەکرێ ئەمیشیان هەر کەمتەرخەمی یە .

### رەخنەگرتن لە دیاردە سلبی یەکان

ئەو هاوڕێیانەی ئەمرۆ قسەیان کردو ئەوەی راست و راستەقینە بوو دەریان بڕی ، بینیمان کەلە خۆوە دەستیان پێکرد . هەرچەندە کە خۆشیان کرێکارن بەڵام رەخنەیان لەو دیاردە سلبی یانە گرت کە لەناو کرێکاراندا هەن و بەمە ئەوەیان سەلماند ئەوان جۆرە کرێکارێك نین اە چوارچێوەی نیقابەکاریدا بڕواننە دەوری کرێکاران ، بەڵکوو رۆڵەیەکی چاکی گەلن و سەرکردەی بەتوانای گشت گەلن بەگشتی نەك تەنیا بۆ کرێکاران ئەوان بەم جۆرە لەگەڵ بیروباوەڕی حزبەکەیان و لەگەڵ شۆڕشەکەیاندا گونجاون کەوای دادەنێ هەر مرۆڤێك لە شوێنی شارەزایی خۆیدا هاووڵاتی یەکی عیراقی یەو دەبێ گشت عیراق ببینێ و بەرژەودندی گشت عیراقی لەبەر چاوبێ و ئاگاداری ئەرکی سەرشان و دەوری نەتەوایەتی عیراقبێ کە لە سنووری زانراوی دەستووری یەوە دەپەڕێتەوە بێ هەموو نەتەوەو بەمە ئەوان بەسەر ئەو باری سەرنجە لەرێلادەرەداتێپەڕین کە دەڵێ ئەنجامی کۆکردنەودی بەرژەوەندەکان دەکاتە بەرژەوەندی باڵا . ئەوان بەم شێوەیە ئەو تیۆرە راستە دسەلمێنن کە دەڵێ ئەنجامی بە یەکدا چوونی بەرژەوندی یە رەواکان لەچوارچێوەی یەك ئامانجدا لەژێرخێوەتی کارێکی ناوەندیدا بۆ گشت ، رێگای هەرە راستە . راست نیە ودها بڕوانینە بەرژەوەندی جوتیاران کە لە مەسلەحەتی کۆمەڵ دابڕاوبێ ، یا وەها بڕوانینە مەسلەحەتی کرێکاران کە لە مەسلەحەتی کۆمەڵ دابڕاوبێ، یا وەها بڕوانینە مەسلەحەتی پزیشکەکان کە لە مەسلەحەتی

کۆمەڵ دابڕاوبێ ، یا وەها بڕوانینە شوێن ئافرەت کە لە شوێنی کۆمەڵو بزوتنەوەی کۆمەڵ دابڕاو بێو ئینجا ئەنجامی کۆکردنەوەی هەموونەمانە بکاتە بەرژەوەندی گشتی .

ئەم جۆرە تیۆری‌یە لە لادان بەولاوە نیەو راستی‌یەکەی ئەوەیە کە هەموو ئەم شوێنو مەسلەحەتانە لە چوارچێوەی تێگەیشتنێکی ناوەندی‌و لە ژێر خێوەتی بەرژەوەندی گەلو نەتەوەدا بە یەکدا بچن کە هەر ئەمەش دەمانگەیەنێتە بەرژەوەندێکی راستو رەوان .

هەندێکتان کە قسە دەکەن وای دەردەبڕن کە شۆڕش بۆ کرێکارانە یا شۆڕش شۆڕشی کرێکارانە . ئینجا کە لەگەڵ جوتیاراندا بەیەك دەگەین ، ئەوانیش دەڵێن شۆڕش شۆڕشی جوتیارانە . کە سەربازو ئەفسەرەکانیش دبینین دەڵێن شۆڕش شۆڕشی سوپایەو بۆ هێزە چەکدارەکانە . کە لەگەڵ ئافردتانیشدا لە یەکێتی ئافرەتانی عیراق یەکتر دەبینین ، دەڵێن شۆڕش بۆ ئافرەتانە .

شۆڕش لە رووی مەبدەئی‌یەوەو لە جێبەجێ‌کردنی بەکردار بۆ گشت گەلە ، بۆ گەلی عیراق ، بۆ ئەوانەی باوەڕیان پێ‌یەتی‌و لە چوارچێوەی باوەڕەکانیدا بەتەنگ جێبەجێ‌کردنی ئەرکەکانی سەرشانیانەوەن، ئەوانەی بەفیکرو بەکردار لە گەڵیدا ناکۆك نین ، بەڵام ئەمە لەگەڵ ئەوەدا دژ ناوەستێ کە شۆڕش شۆڕشی جوتیاران بێو شۆڕش شۆڕشی هێزە چەکدارەکان بێو ، شۆڕش شۆڕشی ئافرەتان‌بێو ، شۆڕشی کرێکاران بێ . بگرە کۆششی هەر دەستەو تاقمێکی کۆمەلایەتی بۆ ئەودی شۆڕش بداتە پاڵ خۆی بەشێوەیەکی تایبەتکاری ، ئەمە نیشانەی راستو دەرکەوتووی شۆڕشەکەتانە . مەبەستیشم لەمە ئەوەیە کە هەر دەستەو تاقمێکی کۆمەلایەتی وەختێ ئەو دەسکەوتانە دەژمێرێ کە شۆڕش پێشکەشی ئەوەی کردوون ، وای لێدەکەن کە بەشانازی‌یەوە خۆی بداتە پاڵ شۆڕش‌و بەشێوەیەکی تایبەتکارو جیاوازی‌یەکی تایبەتی لە دەستەو تاقمەکانی‌تر .

لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ لەم‌باسەدا هەندێ‌بیروڕای کۆمەلایەتی بخەینەروو . کرێکاران کاتێ دەیانەوێ دەست بەسەر شۆڕشدا بگرن لە رێی کرداری جیاوازی ئەوان کە شۆڕش هی ئەوانە یان ئەوان سەربەشۆڕشن ، ئەوانراستی‌یەکی بابەتی‌یانە لەم کردارەدا دووپات دەکەنەوە ، چونکە کرێکاران پێش ئەوەی شۆڕش پەیدا ببێ ، (میقداری) ئەو ستەمە ئابووری‌یەو ئەو ئازارو برسیەتی یەشی کە بە جیاکاری لەگەڵ دەستەو تاقمە کۆمەلایێتی‌یەکانداو بە بەیەك گرتنێکی نیسبی لەگەڵ دەستەو تاقمە کۆمەلایێتی‌یەکانی تردا پێ‌یان دەگەیشت ، لە هی هەموو دەستەو تاقمە کۆمەلایێتی‌یەکانی تر زیاتر بوو ، لە هی هەموویان بەنالەترو دەرکەوتووتر بوو . جوتیاران کاتێك بەشێوەیەکی تایبەتکاری تر لە دەستەو تاقمە کۆمەلایێتی‌یەکان خۆیان ددخەنە پاڵ شۆڕش‌و دەڵێن شۆڕش شۆڕشی جوتیارانە ، ئەوان دووبارە راستی یەکی کۆمەلایێتی‌و ئابووری پەیوەندار بەو بیروباوەڕانە دووپات دەکەنەوە کە پەنجەمان بۆ راکێشانو کە دووبارە بەسەر کرێکارانیشدا ددگونجێ ، چونکە ستەمو ئازاری کۆمەلایێتی‌و ئابووری‌و ئەو شوێنە کۆمەلایێتی‌و ئابووری‌و سیاسی‌یەی کە جوتیار دەچێتە چوارچێوەیەوە بە بەراوردکردن لەگەڵ دەستەو تاقمە کۆمەلایێتی‌یەکانی تردا ، ئەوان زیاتر لە کەسانی ترو لە دەستەو تاقمە کۆمەلایێتی‌یەکانی تر لەئازاردا بوون. ئافرەت کاتێ دەیەوێ خۆێ بداتە پاڵ شۆڕش یا بەشێوەیەکی تایبەتکار شۆڕش بەهی خۆی بزانێ ، لەبەر ئەوەیە کە پێشتر لە دوو شوێنەوە ستەم لێکراوبووە . ستەم لێکراو بووە بەوەی کە بەشێکە لە کۆمەلێکی کۆمەلایێتی وەك خۆی وەك بەشێك لەئازاردانی تێکڕ ی کۆمەلگای عیراق . لە مالیشدا ستەم لێکراو بووە . کاتێ شۆڕشیش دێ بۆ ئەوەی، وەك بەشێك لە رزگارکردنی تەواوی کۆمەڵ رزگاری بکاو دووبارە لە مالیشدا سەربەستی بکا ، بۆ ئەوەیە کە شوێن‌و پایە کۆمەلایێتی‌و ئابووری‌یەکەی بگۆڕێ . لەمەوە دەبینێ کە ئەو بڕوبیانووانەی لەبەردە میدان بەسن‌وو پالی پێوددەنێن کە حەماسەتی هەڵسێ‌و بلی شۆڕش هی ئافرەتە . هەروەها ئەوەی کە پەیوەندیشی بەدەستەو تاقمە کۆمەلایێتی‌یەکانی ترەوە هەیە ، بەڵام شتێکی راستە .

### شۆڕش هی گشت گەلی عیراقە

ئەی هاوڕێ‌یان ، ئەی برایان ، شۆڕش هی گشت گەلی عیراقە ، هەرچەندە ، بەخششەکان بەشێوەیەکی نیسبی لە نێوان بەخششێك‌و بەخششێکی تردا

جیابن ، چونکە شۆڕش گشت گەلی عیراقی رزگارکردوەو ئابڕووی پاراستووەو لە عیراقو لە نیشتمانی عەرەبو لە جیهاندا لە شوێنو پایەیەکی سیاسی نوێیدا داناوە. هیچ دەستەو تاقمێکی کۆمەلاێتی لە هەموو عیراقدا نەماوە ئەوە نەزانێ کە ئەودی شۆڕش لە شوێنو پایە پێشکەشی کردوە لە رووی ئابووریو کۆمەلاێتیو سیاسیو شتیتریدا ، لە شوێنو پایەی پێشووی پێشکەوتووترە . بەلاَم ئەو دەستەو تاقمە کۆمەلاێتی یانەی بە حسابێکی نیسبیو بەراورد لەنێوان کرێکارانو لەنێوان پزیشکانو لەنێوان جوتیارانو لەنێوان ئەندازیارانو لەنێوان سەربازانو لەنێوان پسپۆڕانی ئابووریدا شۆڕش بەخششی پێداونو ئەوانەی بەحسابی نیسبی زیاتر بەخششیان لە کەسانی تر وەرگرتوە ، لەیەك ساتدا دوو ئەرکیان لە ئەستۆیە ، یەکێکیان ئەرکی کارکردنە لەپێناو شۆڕشەکەیاندا ، چونکە ئەوان وەك بەشێك لەو رزگاربوونە گشتییەی کە هەموو عیراقییەکانی پێ لە زولمو دواکەوتەییو چەوسانەوەو ستەمو ئابڕووبردن ئازاد بوون ، ئەرکێکی تریش ئەوەیە کە لەگەڵ ئەو بەخشش پێدانە زیادەدا دەگونجێ کە لە کەسانی تریان زیاتر دراوەتی بەوەی کە شۆڕش پێشکەشی کردوون بۆ پڕ کردنەوەی ئەو پەیوەندییە دواکەوتووییەی کە لە ناو کۆمەڵدا باو بوو . کرێکاران ئەرکیان لە کەسانی کە زیاتر لەسەرە لەوەدا کە هەموو رۆژێ بیسەلمێنن کە ئەوان زیاتر لە کەسانی سوود بەشۆڕش دەگەیەننو ئیتر مەودای ئەوە نەمێنێ کە بوترێ : شۆڕش بۆ ئەوانە . جوتیارانیش لە سەریانە هەموو رۆژێ بەوردی بیسەلمێنن کە ئەوان لە بەخششو لە قوربانیدانداب‌ەشێوازو تایبەتکارییەکی جیا لەدەستەو تاقمەکانی تر کۆمەڵ سوود بەشۆڕش دەگەیەنن ، بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە شۆڕش بۆ ئەوانە . هەروەها هێزە چەکدارەکانیش کە شۆڕش لەوەتی بەرپابووە چاوەدێرییەکی تایبەتی پێ داون ، دە بێ بەشێوازو بەشێوەو بەشێوەیەکی هەمیشەییو وردو رۆژانەی وا خۆشەویستیو کارکردن پێشکەش بکا کە ئەو تایبەتکارییەی شۆڕش پێی بەخشیون لە شوێنی راستی خۆی دابە . ئینجادوای ئەمە ئەو قسەیەی کە دەڵێ شۆڕش هی هەموو گەلە راست دەردەچێو شۆڕش هی هەموو دەستەوتاقمێکی گەل دەبێو هەر یەکە بەجیاو بەپێی ئەو بیروڕایانە دووبارە راست دەردەچێ .

پێش ماوەیەك لە گەیشتنێکماندا لەگەڵ ئەو برایانەی کە لە کەرتی چنیندا ( هەندێ ئیشکەرانی کەرتی چنین ) لە کاظمیە ئیش دەکەن . پێمان وتن ، سەرکردایەتی دوای ماوەیەکی درێژ لە گفتو گۆکردنو لێکۆلینەوە ، ئێستا دیراسەیەکی دەخرێتە بەردەم کە دەربارەی بەڕێوەبەریەتی دیموکراتیانەیە لە ناو دەولەتدا تەواو کراوەو ئەم دیراسەیەش تائێستا لە خشتەی کارەکانی سەرکردایەتی دایەو کاتێ سەرکردایەتی لێی دەبێتەوەو دواکەوتنیشی بەهۆی خەریك بوونی سەرکردایەتییەوەیە بە کاروباری تری زانراو کە لەپێش هەموویانەوە ، پەیوەندیی نوێی نێوان عیراقو سوریایە .

## دیموکراتیەت بڕیارێکی مەبدەئییە

مەبەس لە دیموکراتیەت لە بەڕێوەبردنی دەولەتدا ، ئەی هاوڕێیان ئەوە نیە لەرێگای ئەوەوە تەنها بە چەندەکیو چۆنەکی بەرهەم چاكبکرێ ، بەزیاترکردنی تێکڕایی بەرهەمەکەو چاككردنی جۆرەکەی یاخود تەنها بەزیادکردنی بەرهەمو چاككردنی جۆرەکەی . بەلکوو بڕیارێکی مەبدەئی مەزنو گەورەیەو لە بنەڕەتەوە لە مەبدەئیەتی شۆڕشەوە هەنگاو هەلدێنێو بەشێوەیەکی بەتەنگەوەبوو یەکێ لە ئامانجە سەرەکییەکان دەردەبڕێو کردارێکە بۆ راست کردنەوەی شوێنی مرۆڤی ئیشکەر لە دەزگاکانی دەولەتداو بۆ بەرزکردنەوەی بۆ شوێنێکی نوێی کۆمەلاێتیو سیاسیو تابگرە ئابووریش ، هەروەها بۆ ئەوەی مەسئولیەتیش بەپێی شێوازە زنجیرەییەکەی کۆتایی پێ بێ کە هەر بەڕێوەبەری گشتی یاخود سەرەك دەزگاو دایەرە تەنها هەر خۆی مەسئولی بەڕێوەبردنی کرداری بەرهەمهێنانەو ئیتر مەسئولیەت بەو پەڕی فرەوانی دابەش بکرێ .

ئەمەش دەبێتە مایەی ئامادەکردنی باری مەوزوعیو دروست بۆ هەلبژاردنی توانای راستو دۆزینەوەی ئەو رۆلانەی گەل کە تیایاندا لێهاتوویی ئەوتۆ هەیە کە بەبێ رەفتارکردنو دەسەلاتداریەتی بەرینی وەکوو ئەمە دەرناکەون . لە هەمان کاتدا لابردنی قەپاغ بۆ دۆزینەوەی شوێنی کەمو کورتی بەگوێرەی بنەڕەتی مەوزوعیو راست . بەم جۆرە لێهاتوو هەرچۆنێك بێ لە بزوتنەوەی دەولەتدا بەرەو

وەرگرتنی شوێن دەچێ ، نەك لەسەر ئەساسی شەهادە .. شەهادە بۆ ئەو شتێکی ترە کە دەخرێتە سەرهەندێ کرداری‌تر کە پێویستە بۆ پێشکەوتن‌تێیدا هەبن . بەڵام ئەوەی کە شەهادەی نیەو لە خاوەن شەهادەکان زاناترە ئەوا ئەو شایانی هەموو رێزلێگرتنێکە بۆ پێشکەوتن بەسەر خاوەن شەهادەکاندا .

## شۆڕش‌و بەرپرسیاری

شۆڕشەکەتان لە بەڕێوەبردنی دەوڵەت‌و کۆمەڵدا ، لەو بنەڕەتەوە سەیری بەرپرسیاری ناکا کەوا تەنها مافی تاقمێکی هەڵبژێرراوە . . . . بەڵکو لەوەوە کەمافی جەماوەروو بەرینترین جەملوەرە لەسەر هەندێ رێ‌وشوێنی زانراو ... بەکارهێنانی دیموکراتیەت .. بەڕێوەبەرایەتی دیموکراتیانە لەم دەوڵەتدا ، هەموو ئیشکەران دەخاتە شوێنێکی تازە کەتێیدا دەتوانن ئیسپاتی‌کەن کەوا لەجێگەیەکی ترەوە لەبارياندا هەیەو ئەو هۆیەیان بۆ دابین دەکا ، کە لێوەی بتوانن بەرەو پێشەوە بچن .

هەروەها لە جێگەیەکی نوێوە ... و بەڕێوەبەرایەتی دیموکراتیانەش دەتوانێ بیروکراسیەت‌و نەخۆشیەکانی چارەسەر بکا و کوتایی‌یان پێ‌بهێنێ‌و کۆتایی بەرەنگدانەوەکانی بیروکراسیەت بهێنێ لە باری‌چینایەتی‌یەوە لە سایشت‌دانی مرۆڤەوە ، چونکە بیروکراسیەت نەخۆشی کۆمەڵایەتی هەیە سەرەڕای ئەو کۆسپە ئیداریانەی کە دروستی دەکا ، دەبێتە مایەی کورت هێنانیش لەسایشتی کۆمەڵایەتیانەی مرۆڤ لەنێوان ژێردەست‌و زووردەستدا .

ئەم جۆرە کارەگەورانە ، هاورێیان پێویستیان‌بە هەوڵێکی گەورەوە هەیە کە ئێوە بیدەن .. پێویستیان بە هەوڵێکی گەورەو بەردەوام هەیە ، پێویستی بە دلسۆزیەکی بەردەوام هەیە کە هەموو رۆژێك‌و بە شێوەیەکی بەرفراوان هەموو کەسێك سوودی لێ وەربگرێ وەکو رەنگدانەوەی هوشیاری‌و تواناتان بۆ بەکارهێنانی ئەم جۆرە مافە .

چونکە نابێ داوای ماف لە شۆڕش بکەیت بێ‌ئەوەی ئەرکەکانی خۆتی بە گوێرەی بیروڕاکانی خۆی پێشکەش بکەی ... بەرپرسیاری گەورەترو گەورەتر دەبێتەوە کاتێك دەزانین کەوا سەرکردایەتی بڕیاری لەسەر دەست‌کردن بە هەڵبژاردنی گشتی بۆ هەموو گەلی عیراق داوەبەرەو دروستبوونی ئەنجومەنی ناوەندیی نوێنەرانی گەل کە دەبێتە یەکێك لە دەزگا دەستووریەکانی نوێنەرایەتی بۆ بەشداری کردن لە بەرپرسیاری دروستکردنی بڕیاروو بنیاتنانی دەوڵەت‌و کۆمەڵدا .

سەرکردایەتی بۆی‌دەر کەوت کە ئێستا وەزع لە رووی ئەو پلەی هوشیاریەوە کە گەل پێی‌گەیشتوە بۆ بەکارهێنانی ئەم مافە بێ‌هیچ لە نگیەك‌و لە رووی دروست بوونی پێویستیەکانی ترەوە لەبارە بۆ بەکارهێنانی .

سەر کردایەتی لە هەشت مانگ لەمەوبەرەوە هەندێ لە هاورێیانی سەکردایەتی قوتری راسپاردوە کە لێکۆڵینەوەیەك بۆ ئەم مەبەستە ئامادە بکەن‌و ئەم لێکۆڵینەوەیە ئێستا خەریکی تەواو بوونەو خەریکە پێشکەش بە سەرکردایەتی دەکرێ بۆ باس‌کردنی‌و پاش ئەوە دەبێ بەیاسایەکی گشتی‌و سەرکردایەتی پاش ئەوە ئەو ماوەیە دیاری دەکا کە بۆ دەست کردن بەکار ، بۆ هەڵبژاردنی نوێنەرانی گەل بە شێوەیەکی دیموکراتیانەی راست نەك بەهیچ شێوەیەکی تر .

## ماف‌و فرمان

یەکێك لەو هۆیانەی‌کەتائێستا بەری لە هەڵبژاردنی نوێنەرانی گەل لە ئەنجومەنێکی لواندنی ناوەندی‌دا دەگرت‌و لەجیاتی ئەو شێوەی تری بەکارهێنانی دیموکراتیەت دەدرایە بەر ، ئارەزووی راستی سەرکردایەتی بوو لەوەدا کە ئەم رەفتارکردنە رەفتار کردنێکی راست‌بێ ، بێ هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەی کێشی رەفتارکردنی دیموکراتیانەی راست بەو جۆرەی کە گەلی عیراق هەڵی دەبژێرێ .

ئەمە ، هاورێیان ، مافێك نیە کە تەنها شانازی پێوە بکەین ، بەڵکو بارێکی گرانە لە سەر شانی ئێوەو لە سەرشانی هەموو لایەکمان ، ئەگەر بەڕێوەبەرایەتی دیموکراتیانەتان بەکارهێناو لە هۆشیاری‌دا ئەوە بۆ ئەو کەسانەی کە دەڵێن گەلانی ولاتانی جیهانی سێیەم ناتوانن دیموکراتیانە رەفتاربکەن ، دەرفەتی هەڵگەڕانەوە پێك دێنن .

ئەگەر لە هەڵبژاردنی نوێنەرانی گەلدا بۆ ئەنجومەنی نوێنەرایەتی ناوەندی گەل رەفتاری دیموکراتیانەتان بەکار نەهێنا ، ئەوا بۆ ئەو کەسانەی کە دەڵێن گەلانی جیهانی سێیەم ناتوانن بە شێوەی

راستو دروست نوێنەرانی خۆیان هەڵبژێرن و ناتوانن دیموکراتیەت بەشێوەی راستی خۆی بەکاربێنن دەرفەتی باش پێك دێنن . باوەڕیش ناکەم ئێوە تەئسیری ئەمە لەسەر ڕێڕەوی شۆڕش لەولاتدا نەزانن ، لەبەر ئەمە ، برایان ، بەر پرسیاریی عیراقیەکان بەگشتی و لەم جۆرە وەزعانەدا گەلێك لەجاران زیاتر بووە . عیراقی ، بۆ ئەوەی هوشیاری دروست بکا بەوەی کە تواناو ئیدراکی لەجاران زیاترە، تابتوانێ مافیخۆی بزانێو ئەو فرمانەش بزانێ کە لە ئاکامی ئەم مافەدا دەکەوێتە ئەستۆی لەبەڕێوەبردنی دیموکراتیانەی دەولەتداو لە هەڵبژاردنی دیموکراتیانەی ئازادی نوێنەرانی گەلدا لە ئەنجومەنی بەرزی ناوەندیی راپەڕاندندا ، تا بۆ هەموو جیهان بیسەلمێنین کەوا لەم جێگایەدا تاقیکردنەوەیەکی نوێ دروست دەکرێ کە نەك بەقسە ، بەڵکو بەکردار ئاوێنەی راستەقینەو ڕۆژانەی ئیرادەوسودو قازانجی گەلەو بە شێوەیەکی راستو ڕۆژانە ئاوێنەی ئامانجو قازانجەکانی نەتەوەیەو بەو جۆرە ئەم پشتەی ئێوە دەتوانێ ناو بنرێ نەوەی تێکۆشەران چونکە ئەم پشتە ڕێو شوێنی دابو رەسم دادەڕێژێ نەك هی یاسا . دابو رەسمی نوێی پوختە ، کە دەشێ لە راستیو لە گاریگەریدا وێنەی لە هەموو جیهاندا نەبێ ، یانبێ وێنەبێ لە چوارچێوەیەکدا کە بەتەواوی بەرینەبێ بە تایبەتی ولاتانی جیهانی سێیەم .

لەبەر ئەمە ، لەم وەزعە دروستەدا کە خۆتان چارەنووسی خۆتان دیاری دەکەن ، هەر چەندتین بێننە سەرخۆتان دەگاتە پلەی رەقکاری لە رەخنەگیری لەو هەلانەی کە ئێوە دەیانکەن ، یان ئێمە لەم جۆرە وەزعە سازەدا دەیانکەین .

## شۆڕشگێران بەرەخنەگرتن ، چەك لەدەستی دوژمنان دەستێنن

هیچ مەترسیەك لە رەخنەگرتندا نیە ، بەڵکو راستتر ئەوەیە کاتێك کە شۆڕشگێران رەخنە دەگرن، خۆیان رەخنە لە خۆیان دەگرن ، بەوە چەك لەدەستی دوژمنو نەیاران دەردەکەن تا رەخنەگرتن بکەنە ڕێگەیەك بۆ دەنگدانو هۆیەکی ناوەندی پێویست بۆ بنیاتنانی کۆمەڵی نوێ .

سەرەڕای ئەو هەموو دیاریکەری پێشکەوتنەی کە باستان کردنو مایەی شادین ، دەبێ بڵێم کە کرێکاران لەم مەیدانەدا ، وەکو جوتیاران لە مەیدانێکیتردا ، هێشتا نەگەیشتونەتە ئەوەی کە دەبێ بیگەنێ لە دەربڕینی ڕۆژانەی هوشیاری بە هەندێ کرداری عەمەلی کە دەبنە مایەی بەدیهێنانی چالاکیان لە زیادکردنی بەرهەمو دلسۆزیدا بۆ قازانجی کۆمەڵ.

ئێوە بە تەنگی کۆمەڵەوەن و ئامادەن هەر یەکەتان ، یان هەریەکێك لەوانی ترتان کە لەم هۆڵەدا ئامادەنیە ، بەشەرەفەوە لە پێناوی داکۆکردن لە نەتەوەو گەلدا بمرن ، ئێمە لەمە دلنیاین ، بەلام هەموو کرێکارێك بەخەمی ئەوەوە نیە لە کاری ڕۆژانەیدا لەو سەعاتانەدا دانراوە ، کارێکی راستی دلسۆزانە لەو هەشت سەعاتەدا بکات کە دانراوە ، هەموو کرێکاران ئەو هانین ، ئەو کەسەی لەو سەعاتانەدا کە دانراون کاری تەواوو راست ناکەن، دژی شۆڕشن ئەگەرلە دلیشدا وانەبن .

چونکە ئەو کاتە دەرفەت بۆ هێزەکانی دژ بە شۆڕش پێكدێنن ، کە ئەم جۆرە کارە خراپە بکەن بە بەڵگە بۆ راستیی مەنتیقی خۆیانو چەوتیی مەنتیقو سایشتی شۆڕش .

هاوڕێیان ، راستڕەوان وەکو هەمیشە ، هەوڵ دەدا لەناو بیرو باوەڕتان هێرشتان بێنێتە سەر نەك لە دەرەوەی بیروباوەڕەوە ..

کە یەکێتی بەدی نەهێنن هێرشتان دێنێتە سەرو دەڵێ ئێوە لە بەدیهێنانی یەکێتیدا سەرنەکەوتن ، هەروەها ئەوکاتەش هێرشتان دێنێتە سەر کە ناتوانن یەکێتی لەسەر بنەڕەتی وردو بە شێوەی راستی بێننەدی تا ئەوکاتە بڵێ ئێوە یەکێتیتان لەسەر بنەڕەتی هەڵە دروستکرد .

لەوانەشە ، سپێرەکانی خۆی لە گەڵ هەندێ سپێردا ، تێکەڵ بکا کە بە سەرپۆشی چەپڕەوی داپۆشراوە ، بۆ هێرش هێنانە سەرتان کاتێك کە سۆشیالیزم ناهێننەدی .

ئەوکاتەش لە سۆشیالیزمدا نەخۆشی وەکو ئەو نەخۆشیانە دەردەکەون کە باسمان کردن ، هێرشتان دێنێتە سەر ، ئەوکاتەی کە دیموکراتیەت بەدی ناهێنن ، هێرشتان دینێتە سەر تا بڵێ دیموکراتیەتی لیبرالی لە سەر شێوەی ڕۆژئاوا تەنها شێوەیەکە بتوانرێ لە هەموو جیهاندا بلاوبکرێتەوەو هۆی ئەوەی نەتان توانی دیموکراتیەت بێننەدی ئەوەیە ئێوە لیبرالی نین ، هەروەها کاتێك دیموکراتیەت بەکار

دێنن‌و ، بەباشی پێویستیەکانی پێشکەش ناکەن ، هێرشتان دێنێتە سەرو دەڵێ ئەم دیموکراتیەتە دروستنیە وگەلانی ولاتانی جیهانی سێیەم هێشتا نەگەیشتۆتە ئەوەی بتوانێ دیموکراتیەت بەدیبهێنێ یان رەفتاری پێ‌بکا .

هەندێ وێنەتان لە واقیعی عەمەلیەوە بۆ دێنمەوە ، هەر یەکێکتان گەر بچێ بۆ مەیدانی چالاکی تایبەتی‌و ئەو کرێکارانە ببینێ کە لە بیناکاریدا کار دەکەن ، بۆی دەردەکەوێ کە هەڵەو چەوتیەکانیان لەم مەیدانەدا چەندێکە ، بۆی دەردەکەوێ ئەو کرێکارەی کە لە باری عەمەلیەوە پێویستە هەشت سەعات کار بکا ، هەندێکیان چوار سەعات کارناکەن .

تەنانەت لە کەرتی تایبەتیشدا ، ئەو کرێکارەی کە لە هەموو ئەوکاتەدا کار دەکا کە بۆی دانراوە ، بێ رەچاوکردنی سروشتی ئەو عەقدەی کە لە بەینیاندایە، چ لە کەرتی تایبەتی یان لە کەرتی سۆشیالیستدا ، ئەو کرێکارەی کار ناکاو ئەو فەرمانبەرەی کار ناکاو ئەو عیراقیەی کە لە تەواوی ئەو کاتەدا کەبۆی دانراوە بەهەموو ئەو وردیەوە کە هەیەتی‌و دەتوانێ بیخاتەکار کار ناکا ، دژی شۆڕشە ، دژی کۆمەڵە ، دژی گەلە ، دژی‌خۆیەتی‌چونکە زیان بە شۆڕش دەگەیەنێ ولەسەر ئەمەزیان بەمنداڵەکانی‌و بە خۆی‌و بە دوا رۆژی خۆی ، بەزیانی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و سیاسی خۆی دەگەیەنێ .

## چالاکی تایبەتی لە کۆمەڵگای سۆشیالیستیدا

چالاکی تایبەتی لە کۆمەڵگای سۆشیالیستدا بەشێکە لە شۆڕشی نەتەوەیی‌و زیان گەیاندن پێی زیانگەیاندنە بە سامانی نەتەوەیی .

لەبەر ئەوە ، هاورێیان پێویستە دڵسۆزی لەکاردا نەك تەنها لە کەرتی سۆشیالیستدا وردبێ ، بەڵکو دەبێ لە کەرتی تایبەتیشدا هەروابێ . بۆچی ؟ چونکە راستی کارکردن لە کەرتی تایبەتی‌دا ، بە هەمان شێوە کە دەبێ لە کەرتی سۆشیالیستدا بێ ، بێ‌گومان لەگەڵ هەندێ جیاوازیدا ... هەندێ جیاوازی جۆرەکی لە نێوان ئەوو ئەمدا . ئەو لە باری عەمەلیەوە خزمەتی سامانی نەتەوەیی‌یە کە سامانی گەلە . کەواتە، ئەگەر لەکاری کەرتی تایبەتی هەندێ رێ‌و شوێنی زانراو هەبێ و بخرێتە بەر رێرەوی بزوتنەوەی سۆشیالیست کە یاسا ناوەندیەکانی دەستکردی دەسەڵاتێکی کە نوێنەری رێبازی سۆشیالیستی‌یەو نوێنەری گەلیشەو لەباری عەمەلیەوە ، ئەم چالاکیەی پێویستەو لە چوارچێوەی رێبازی سۆشیالیستدا دەویسترێ ، مادام ئەم جۆرە چالاکیە پێویستەو ئەگەر وانەبێ ، ئەوا لەکار دەکەوێ . شۆڕشی سۆشیالیستیش لە هەموو کاتێکدا توانای ئەوەی هەیە هەر جۆرە چالاکیەکی تایبەتی لەکار بخا کە لەگەڵ رێبازی‌دا ناگونجێ .

کاتێ کە پێویست دەبێ ، بەڵکو دەویسترێ ، ئەو کاتە زیان پێ‌گەیاندنی ، زیان دانە لە قازانجی نیشتیمانی‌و نەتەوەیی ، زیان دانە لە سوودی کرێکاران ، زیان دانە لەسوودی جوتیاران ، زیان دانە لەقازانجی ولات کاتێ کە بەم جۆرە بێ لەسەر گرنگیی کارکردنی ورد لە تەواوی کاتی دانراودا تەنانەت لە کەرتی تایبەتیشدا دادەگرین،ئەوە دەزانرێ چەند پێویستە پێ لەسەر رێزگرتنی کات‌و دەستەبەری کردنی بەوردی کارکردن لەکەرتی سۆشیالیستیدا دابگرین .

چۆن سەیری داواخوازی دەکەین لەقۆناغی تێکۆشانی سەلبی داو چۆن لەقۆناغی بیناکاری سۆشیالیستیدا سەیری دەکەین ؟ داوا خوازی لە تێکۆشانی سەلبی‌دا شێوەیەکی سیاسیە ، سەرەرای ئەوەش کە شێوەیەکی کۆمەڵایەتی‌و ئابووریشە ، واتە لەرێی ئەوەوەو لەچوارچێوەی کەرتی ئیشکەراندا قەوارەی کۆنەپەرستی لەقەو لۆق دەکا ، قەوارەی ئەو سیستەمانە لەقەو لۆق دەکا کە دژبە کرێکارانن‌و لە هەمان کاتدا دژبەگەلیشن . بەڵام لە بیناکاری سۆشیالیستدا ، خاوەن کار لە دوا ئاکام و دوا ئەنجامدا نوێنەری کرێکارانە ، خاوەن کار لە سیستەمی سۆشیالیستدا نوێنەری کرێکارانە چونکە نوێنەری ئەو دەسەڵاتەیە کە ئاوێنەی سوودو قازانجی گەلە .

لە ناو ئەم سوودەداو جێگەیەکی ناوەندی بۆ قازانجی کرێکاران هەیە بەپێی ئەو شێوەیەی کە بەر لە نەختێك باسمان کرد .

ئەم جۆرە وەزعەی رێ‌و شوێنی خاوەن کاری نوێ لە کەرتی سۆشیالیستدا ، رێی‌و شوێنی داواخوازی ناکاتە ئەوەی لە پێشودا بەکار دەهێنرا .

رێ‌و شوێنێکی تری نوێی هەیە ، کە بریتی‌یە لە رێ‌و شوێنی ئیختساسی کەرتی کە دەتوانێ ئەودی

کەمەیدانی‌یە باشتر ببینێ لە شوێنەکەی تردا .

ڕێ‌و شوێنی داوا خوازی ، لەجیاتی ئەوەی وەکو ڕێ‌و شوێنی ناکۆکی پێویست‌و ویستراو بۆ بیانوکاری لەکاری سیاسی‌دا دژی دەسەلاتدارێتی ، یان بۆ بچڕینەوەی داخوازی نیقابی ، بە تین‌ڕینەوە ، لەسیستەمی سۆشیالیستدا بخرێتە روو ، بەرێ‌و شوێنی قسەو گفتوگۆکردن دەخرێتە روو تا ئەوانی تر لەو پێویستیە عەمەلیانە بگەن کە بۆ بەرزکردنەوەی ئابووری‌و کۆمەلایەتی ئیشکەران پێویستن ، بەرێ‌و شوێنی گفتوگۆکردنی دیموکراتیانە نەك بە شێوەی شان لە شان‌دان لەگەل نەبوونی هیچ ئامانجێکی سیاسی‌دا ، ئەو ئامانجە نەبێ کە گفتوگۆکە دەکاتە ڕێگا بەرەو داچەسپاندنی جێگاکانی شۆڕش‌و خزمەت‌کردنی کۆمەلگا بەگوێردی ڕێبازی نوێ .

بۆ بەجێ‌هێنانی کاری باشتر ، نابێ خۆتان لەگەل خەلکی تردا بەراوردبکەن ، بەلکو دەبێ کاری خۆتان لەگەل ئەوەدا بەراوردبکەن کەدەبێ وابێ ... نابێ‌و ناکرێ کارێکی چەوت‌و سایشتێکی چەوتە ... ئەگەر جوتیار بلێ من لە کێلگەی دەولەت کار ناکەم چونکە فلانە فەرمانبەر بەگوێرەی پێویست کارناکا .. یان کرێکار بلێ ، باش کار ناکەم چونکە فلانە فەرمانبەر باش کار ناکا . بەراورد کردنی ئەوەی کە باشە ئەوەی کە باشنیە لەسەر ئەساسی ئەو کەسانە نیە کە هەلە لە فرمانی خۆیاندا دەکەن ... بەلکو بەراورد دەبێ لەگەل ئەو نموونەیەدا بێ کە باز بەسەر فرماندا بەرەو شتی‌باشترو پوختەتر دەدا بەراورد دەبێ لەسەر ئەساسی ئەو فرمانەبێ کە هەریەکەمان لەسەریەتی لەچوار چێوەی ئەو ڕێ‌و شوێنە ڕاستانەدا کە شۆڕش‌و دەزگاکانی ڕاپەڕاندن بەجێ‌ی دێنن ... و هەمیشە دەبێ لەبیرمان‌بێ ، کەمافی زۆرتر واتە فرمانی زۆرتر ، بەلکو داواکردنی مافی زیاتر دەبێ پاش گرتنە ئەستۆی فرمانی زیاتربێ .

## ● ئەرك‌و ئیمتیاز

هەندێك لەو برایانەی باوەڕنامەی دکتۆرایان هەیە تەلەفۆن بۆ خۆم دەکەن ، یا دەیانەوێت لەگەل هاوولاتیاندا چاویان پێم بکەوێت .. دێن‌و ئیمتیازیاتیان دەوێت .. جۆرە یاسایەکی وایان دەوێت کەوایان لێ‌بکا ئیمتیازیان هەبێت بەسەر گەلی عیراقدا ، لە کرینی ئۆتۆمبێلدا وەیاخود لەوەدا خانووی هەبێت وە یا لە چاکەی تردا ، بەلکو لەگەل هەموو داخێکدا هەندێکیان ددگاتە ڕادەی ئەوەی شەرمیان لە خۆیان نایەت‌و دەلێن .. گەورەم من لە ئەمەریکاوە هاتووم‌و لەوێ دەمتوانی چاکتر بژیم .. ئەمە شتێکی بە ئازارە .. شتێکی ناخۆشە کە هەست بەوە نەکا ئەو کرێکارە چەندی پێ بەخشیوە کە مردو دەرمانی نەبووە چارەسەری خۆی پێ‌بکا ، ئەو جوتیارەی مردوو نەیتوانیود بگاتە خەستەخانەیەکی نزیك . چەندەیان پێ بەخشیوە بۆ ئەوەی بڕوات‌و لە ئەمەریکا دکتۆرا بخوێنێت ، وەیا لە ئینگلتەرە لە باتی ئەوەی هەست بەوە بکا کە لە خەلکی تر زیاتر ئەرکی بەسەر شانەوەیە بەرامبەر ئەم نیشتمان‌و ئەم گەلە کە بە هۆی تەقەللای خەلکی تردوە خستوویەتە ئەو جێگایە کە لەوانی جیا دەکاتەوە لەباتی ئەوەی هەست بکا کە ئەرکی گەورە ترو قورسایی زیاتری لە ئیلتیزامات دەکەوێتە ئەستۆ دێت بۆ ئەوەی ئیمتیاز بەسەر گەلی عیراقیدا وەربگرێت . ئەو جۆرە کەسانە ڕوو بەڕوو پێم دەوێن لەگەل ئەوەدا من کە« مەسئوولم » ئازارم بەم قسەیە دەچەشت کە پێیان بلێم .. بۆ لە ئەمەریکاوە هاتن .. وە بەراستی ئەو جۆرە کەسانە ناتوانن خزمەتێکی ڕاستەقینەی ئەوتۆ ببەخشن ، ئەوەی بەراستی خزمەتی نیشتمان دەکا ئەو مرۆڤەیە کە لە ڕەگ‌و ڕیشەیدا دەژی ، لە ڕەگ و ڕیشەیدا ژیانێکی ڕاستەقینە دەژی‌و دەیەوێت زیاتر خزمەت بکا .. زیاتر پێشکەش بکا .. زیاتر ماندووبێت .. عەول‌و تەقەللایەکی زیاتر پێشکەش بکا هەموو ڕۆژی هەست بەوە دەکا کە چاکەی کۆمەلی بەسەرەوەیە . چاکەی نەتەوەو چاکەی گەلی بەسەرەوەیە، چاکەی نیشتمانی بەسەرەوەیە .. ئێمە گەلی خۆمانمان تەنیا ئەوکاتە خۆش ناوێت کە لە هەموو شتێکا ڕاست‌بێت .

## خۆشەویستی گەل

ئەم گەلەمان خۆش دەوێت کاتێ « چەوتە » خۆشمان دەوێت ( کە ڕاستە ) خۆشمان دەوێت‌و ئەرکی ئەوە دەخەینە سەر شانمان کە ئەو چەوتیانەی تیایدایە ڕاستی بکەینەوە ، بۆ ئەوەی بکەینە ئەو ڕاستی‌یە کە دەمانەوێت ، نەتەوە پێویست نی‌یە کە دەرچوویەکی ئەمەریکا یا ئینگلتەرە خۆشیان بوێت کە بە تەواوەتی ڕاست بێت‌و هیچ جۆرە

نەخۆشی‌یەکی نەبێت ، نابێت ئەو کاتە بیەوێت بگەڕێتەوە بۆ نیشتمان کاتێ گەل لە گەشەکردن‌و کۆمەڵ گەشاوە بێت پێویستە بە پێچەوانەوە ئەو کاتە هەست بکا کە چەوتی لەناو گەلدا دەبێت لە ناو کۆمەڵدا دەبێت ئێستاکە پێویستی زیاتر .. زیاتر لە وەی کە پاش دە سالی تریێمان دەبێت .

ئێستاکە کەلرپەلی خۆی پێش رۆژێك بپێچێتەوە بۆ ئەوەی بکاتە خاکی نیشتمان ، تاودکو خزمەتێکی زیاتر پێشکەشی گەل‌و .. گەل‌و نەتەوەو نیشتمان ئەگەر ئەم لەیەکچوونە بگونجێت وەك باوك‌و دایك وایە .. هاوڕیان دایکت ئەگەر مەنتقێکی هەبوو ئەو دایکتە وە ئەگەر مەنتقیشی چەوت بوو لە سەرت پێویستە راستی بکەیتەوە .. ئەرکەو بەسەر شانتەوەیە .. ئەگەر لەش‌ساغە دایکتەو ئەگەر نەخۆشە دایکتە .. ئەمەیە روانگە بۆ نیشتمان پێویستە ئاوا بروانرێتە گەل بروانرێتە نەتەوە ، نابێت کاتێك گەل‌و نیشتمان‌و نەتەوەمان بوێت کاتێ لە قۆناغی گەشەکردندا بێت یا لە قۆناغی سەرکەوتندا بێت ، ئەم جۆرە پەیوەندیە پەیوەندیەکی دلسوزی قوولی راستەقینە نی‌یە ، هۆشمەندی ناتەواوەو هەستی راستەقینەی بە ئەرکی سەرشان کردنی ناتەواوە ، ئەمە هەموو عیراقیەك دەگرێتەوە ، ئەو پزیشکەی چاك تیمار ناکا چاك فەحسی نەخۆش ناکا لەو کاتە تایبەتی‌یەی بۆ ئەو کارە تەرخان دراوە ، ئەوە دژی نیشتمانە ، دژی گەلە دژی نەتەوەیە دژی خۆیەتی ، ئەو لە ئەنجامدا نەك بەمەبەست‌و نەك بە شێوەیەکی راستەو خۆ ، لە ئەنجامدا ئەو بە کردار خزمەتی ئیستیعمار دەکا ئەو لێکارەی چاك ئیش ناکا هەروەها وتمان سیفەتی چی‌یە هەروەها جوتیارێك هەروەها سەربازێك ، ئافرەت ، پیاو لە هەموو مەوقیعەکاندا سەرکردەیەکی سیاسی‌و جوتیارێکی ساکار هەمان وەسف دەیان گرێتەوە بۆ ئەو کارەیان کە بە وردی نایکەن‌و بۆ ئەو کارەیان کە هۆو ئەو کاتەی تیا بەکار ناهێنن کە بۆی تەرخان کراوە زانست پێویستە کە بەردەوام هەموو توانامان بخەینە کاروبەرۆشنبیری‌و زانست بۆ ئەوەی جلەوی بگرینە دەست لە هەموو « ئیختساساتێك » ، بەلام پێویستەبزانین کە کتێب رۆژێك لەرۆژان ناتوانێت جێگای تاقیکردنەوە بگرێتەوە ... لەوانەیە تاقیکردنەوە بتوانێ لە ژیانی کۆمەلایەتیدا شتی چاك پێشکەش بکا ، لە راستیدا دەشتوانێت ، بەلام کتێبێك بەبێ تاقیکردنەوە ئەگەر تێکدەر نەبێ سوودی کەمە ، وەیا هەر سوودی نی‌یە ، بەلام هەر وەك لە پێشەوە ، وتمان ، هەر مرۆڤێك بیەوێت زیاتر خزمەت بە گەلەکەی پێشکەش بکا لە سەری پێویستە لە پێناوی ئەوددا تێکوشێت جلەوی ئەو زانستە بگرێتە دەست کە لە کتێبدا هەیە ، ئەو رۆشنبیری‌یەی لە کتێبدا هەیە ، هەروەك هەنگاو هەڵهێنانی بۆ گەیشتن بە مونەشیراتی راست لە لایەن شارەزایی‌یەوە بە هۆی تێکەلاو بوونی واقیعێکی زیندووی رۆژانە ..

یەکێك لە برایان ئەوەی دەست‌نیشان کرد لە گشتی‌ی بەرهەم‌و بەرهەم‌هێنان زیادی کرد دوای ئەدوە مەرکەزێکەی لەو هۆیانەی کۆلیەوە کە بوونەتە مایەی نزم بوونەوەی بەرهەم بە جۆرێکی زیاتر بلند بۆو وە گورجتر لەو قۆناغەی دوای شەش مانگ بەدوایدا هات ، دوای شەش مانگ لە نزم بوونەوەی بەرهەم هێنان ، ودیا لە ئەدیە مەرکەزێکەی بۆ نزم بوونەوەی بەرهەم‌هێنان گیرا ، تاوەکو شەش مانگ شێوەکە لە بەرزیدا بوو دوای ئەوە لەگەڵ داخدا دەستی بەنزم کردنەوە کرد هەست بە ئەرکی سەرشان کردن لە شەش مانگدا ، لەوە دەچێت کە هۆی مەرکەزیی دەلیم هەموو هۆکان .

● ترس کۆمەڵ دروستناکا .

هۆ مەرکەزیکەی سل‌کردنەوە وترسە . ترس کۆمەل دروست ناکا ، کۆمەلێك دروست ناکا بۆ ئەوە بشێ کە لە لێوارەکانیدا نیشتمانی عەرەب بلرەوشێنەوە وەیا تا دەر وەی نیشتمانی عەرەب ، لەوانەیە کار گورج بێتەوە ، وردەکاریەکی مەکینە ئاسایانە دەکرێت ، بەلام ناتوانێ داهێنان پێشکەش بکا ، ناتوانێت ببێتە رێگای ئەو دەست‌پێشکەری‌یەی کە مرۆڤ کۆمەڵ بەرەو پێشکەوتن بەرێت ، هۆشمەندی‌و هەست بە ئەرکی سەرشان کردن‌و دەرك پێ‌کردنی ئەو سیفانەی کە ئەم شت‌و ئەو شت بە جۆرێکی راست لێك‌دەداتەوە ئەوە رێگامانە بۆ زیادکردنی بەرهەم‌و بەرهەم هێنان بە شێوەیەکی مەرکەزیی بەبێ ئەوەی لە حیساب کردنماندا بایەخی بەڕێوەبردن‌و زەبتی بەڕێوەبرن‌و موحاسەبەو سزایەکی راستەقینەی مەبدەئی‌و مەوزوعی بۆ هەموو کارێکی چەوت‌و سست لابەریت . بەلام پشت بەترس بەستین لە ترسی سزادان بە تەنیا ، بۆ ئەوەی

کۆمەڵێکی نوێ وەك ئەم کۆمەڵە پێك بهێنین ئەوە پێك ناهێنرێت . هەروەها جارێکی تر ئەوە دووپات دەکەینەوە ، هەموو ئەوەی وا تێدەگەن کە حەقەو زروفەکەی پێگەیشتووە ، وا ئەزانن هاورێکانتان لە سەرکردایەتی ناتوانن هەست بەوە بکەن .

بەڵام دەبێت بەڵگەیەکی کارامە لە ئارادابێت بۆ لێکدانەوەی هەر حەقێك لەو حەقانەی کەوا تەسەوری دەکەن زرووفی پێگەیشتوە لە حیسابی خۆتاندا ، چونکە ئێوە لە مەیداندا لێکدانەوەی گشتیتان هەرچۆنێك بێت ناتوانن هەموو شتە تایبەتەکانی لێکدەنەوە وەك سەرکردایەتی لێکی دەداتەوە . جارێکی‌تر دەبێت ئەوەمان بەردەوام لەبیر بێت کە زیادبوونی رۆژانەو مانگانە ئەوە تەنیا رێگایەکی راست‌نی‌یە بۆ چاك کردنی باری کۆمەڵایەتی‌و رۆشنبیری‌و ئابووریی گەل بەڵکو هەر ئەو جاری وا هەیە دەبێتەرێگای زۆربوونی شڵەژان‌و تەنگە نەفەسی گەل لەگەڵیدا ژیانی ئابووری‌و کۆمەڵایەتیان .

پێشخستنی دایەنگای کرێکاران دەستکەوتێکە ، ئەوە بە شێوەیەکی عەمەلی رەنگ بۆ سەر پلەی گوزەرانی دەداتەوە ، چونکە دوای ئەوە دەتوانێ بواری ژنەکەشی بدا بۆ ئیشکردن . چاك‌کردنی چاوەدێری تەندروستی‌و رۆشنبیری‌و بڵاو کردنەوەی بە شێوەیەکی فراوانتر لە دیهات‌و شارەکاندا ئەوە دەستکەوتەو هێزی کرێن بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ بەهێز دەکا ، لە کاتێکا مرۆڤ لە لایەنی کۆمەڵایەتی‌و رۆشنبیری‌و تەندروستی‌یەوە بەرزدەکاتەوە بۆ جێگایەکی نوێ پێشخستنی بەخشینی خانووی نیشتەجێ بوون بۆ کارگێران بە پێی پێشخەریەکی تایبەتی ئەوە کاری زیادکردنی توانای کرینە بە شێوەیەکی راستەوخۆ نەوەك بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ ، چونکە پارەی کرێکەت بۆ دەگێرێتەوە . بەڵام ئەگەر مانگانەکەت زیادکراو نرخی چای چایخانەکان زیادی کردو نرخی جل‌و بەرگ زیادی کردو نرخی فلان شت زیادی کرد بە شێوەیەکی عەمەلی کۆمەڵ دەخرێتە ئەڵقەیەکی ئەنجام بە تەنگەنەفەسی ئابووری گەڕاوەوە .

هەروەها بەبێ ئەوەی وەزعی کۆمەڵایەتیت لە دوا ئەنجامیدا چاکبوونێکی راستەقینە چاك بێت بەرامبەر وەزعی ئابوورێت ، ئەم قسەیە موبەڕەر نی‌یە بۆ ئەوەی ناوەبەناو چاو ئەگێردرێتەوە بە

رۆژانەو مانگانەدا ، بەڵام وانەڕوانینە ئەوە کە تەنیا رێگایەکی راستە بۆ چاك کردنی شوێنی کۆمەڵایەتی‌و لە گەڵیدا چاك‌کردنی توانای کرینی هاوولاتیان . سوپاس بۆ ئێوە ئەی هاوڕیان‌و سوپاس بۆ ئەو هاوڕیانەی قسەیان کردو ئەوانەی بە جەسارەتەوە قسەیان کردو ئەوانەی لە خۆیانەوە دەستیان پێ‌کرد . چونکە ئەوە رێگای راستە لە چاك کردنی هەڵەداو هەنگاونان بۆ چاکتر .

بەرێز جێگر دەوروبەری سەعات دەی سەر لە بەیانی گەیشتە بارەگای یەکێتی‌ی گشتی‌ی نیقابەی کرێکاران لەوێ هاورێیان عدنان حسین‌و غانم عبد الجلیل‌و سعدون شاکرو محمد عایش‌و محیی عبدالحسین ئەندامانی سەرکردایەتی قوتری حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی ئەندامانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش‌و سەرۆکی مەکتەبی راپەڕاندنی یەکێتی‌ی وئەوانەی لە کۆبوونەوەکەدا بەشداریان کردووە کە ئەندامانی مەکتەبی مەرکەزیی کرێکاران‌و مەکتەبی راپەراندنی یە کێتی‌ی گشتی نیقابەی کرێکاران‌و سەرۆکەکانی یەکێتی‌یە ناوخۆیەکانی نیقابەکانی پارێزگاکان بەشداریان تێدا کردووە پێشوازیان کردووە .

بەرێز مۆید عبدالله سەرۆکی مەکتەبی راپەڕاندنی یەکێتی‌ی گشتی‌ی‌نیقابەی کرێکاران‌خۆش بەختی‌و شانازی خۆی‌و چینی کرێکارانی بەرامبەر بەشداری بەرێز جێگر لە کۆبوونەودکەدا نیشان داوە ئەوەی دووپات کردۆتەوە کە چینی کرێکاران ئامۆژگاریکانی جێگری بەرێز دەکاتە بیرو باوەڕێك لە کاری رۆژانەیدا رێنمایی پێ‌دەکات بۆ بەجێ‌گەیاندنی ئەرکی سەرشانی بە شێوەیەکی دروست ، هەروەها وتی.. لە ولاتدا پەیمان بە جێگری بەرێز سەرکردایەتی دەدەین کە ئێمە چاکترین دەور لە کاری پەرەپێدان‌و بنیات‌نانی سۆشیالیستی‌دا نیشان دەدەین‌و چینی کرێکاران هۆشمەندو هێزێك دەبێت بۆ پارێز گاریی بیروباوەڕو ئامانجەکانی حزبی سەرکردەمان حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست .

دوای کۆتایی ئەو کۆبوونەودیەی کە دەورووبەری چوار سەعاتی خایاند بەرێز جێگر لە لایەن هاوڕیان ئەندامانی سەرکردایەتی قوتری‌و ئەندامانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرشەوە ئەوانەی لە کۆبوونەوەکەدا بەشداریان کردبوو بە گەرمی بەرێ کرا .

**ئا . د . ع**

# لەیادی بەیاننامەی ئادارو دەرچوونی یاسای ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستاندا

سعاد ادیب

ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە یانزەی ئاداری ساڵی ١٩٧٠دا بەیاننامەی ئاداری دەرکرد کە ڕێبازی ئاشتیو دیموکراتی بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کوردی جێگیرکرد . هەروەکو لە یانزەی ئاداری ساڵی ١٩٧٤دا ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش یاسای ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردوستانی دەرکرد کە ئەمەش بەکردەوە ڕێبازی ئاشتیو دیموکراتی ساخکردەوە کە سەرکردایەتی حزبو شۆڕش لەژێر ڕۆشنایی بۆچوونە مەبدەئییەکانی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کوردی گرتبویەبەر . دەرچوونی یاسای ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستان بە هەنگاوێکی گەورەی ئەو ڕێبازە ڕاستە ئەژمێردرێ . زامنکردنی یەکێتی چارەنووسی هاوبەشی گشت ڕۆڵەکانی گەلی عیراق ئامانجیەتی . دەرچوونی بەیاننامەی یانزەی ئاداری ساڵی ١٩٧٤ لە تێکڕای ڕەوتی شۆڕشگێرانەی عیراقی شۆڕشی ١٩٦٨ دانەبڕاوە . ئەو ڕێڕەوەی کە سەرتاپاگیریەکەی بەو ڕادەیەبور کە هەموو ئەو مەسەلانەی گرتەوە کە حکومەتو ڕژێمەکانی پێش شۆڕشی ١٧ی تەموز لە توانایاندا نەبوو چارەسەریانبکەن .

ڕێڕەوی شۆڕش بۆ چارەسەرکردنی هەموو مەسەلە سیاسی ، ئابوری ، گەشەسەندن ، پەروەردەیی ، کۆمەلایەتی ، کشتوکاڵی ، ئاوەدانکردنەوە ڕۆشبیری ڕێگای بەرە و پێشچوونی بڕی . یاسای خۆماڵیکردنی کاروباری کۆمپانیا مۆنۆپۆلییەکانی نەوتو یاسای پلانو نەخشەو گەشەسەندنی ئابووری و هەنگاوە گەورەکانیتر لە مەیدانی پێشکەوتنی پیشەسازی ، کشتوکاڵی ، ڕاگەیاندنی دامەزراندنی بەرەی نیشتمانیو نەتەوەیی پێشکەوتوخواز ، یاسای نەهێشتنی نەخوێندەواری تا ئەگاتە ڕاگەیاندنی پەیمانی کاری نەتەوەیی نێوان هەردوو وڵاتی برا عیراقو سوریا .

ئەم دەسکەوتە گەورانە لە مێژووی گەلەکەماندا سەرتاپاگیریی باری سەرنجی حزبەکەمانو بەرنامە کاملەکەی دووپاتو ساخئەکەنەوە . لە ئاداری هەموو ساڵێکدا یادی دەستکەوتە گەورەکان نوێ ئەبێتەوە ... بۆ ئەوەی قوڵبێتەوەو ڕنجداکوتێ .

دەرچونی یاسای ئۆتۆنۆمی چەند هەنگاوێکیتری بەدوادا هات بۆ زامنکردنی جێبەجێکردنی یاساکە . هەردوو ئەنجومەنی ڕاپەراندنو یاسادانانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی دامەزراو لە ٥-١٠-١٩٧٤ بە پێی ڕێو شوێنی یاسایيو بەڕێوەبەرێتی دیموکراتییانە دەستیانبەکارکرد .

هەروەکو کاروباری پسپۆڕیو دەستەڵاتو دەزگاکانی کار بەڕێوەبردن لە جێگاکانی پێشوویانەوە گواسترانەوەو خرانە دامو دەزگای ئۆتۆنۆمییەوە کە ئێستاکە بە پێی یاسا هەموو جەشنە کاروبارێکو دەستەڵاتێکی خۆی بەڕێوەی ئەبات . پێش چەند مانگێك ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بۆ تەواوکردنی کاریگەری دامو دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی بڕیارێکی تری گرنگی دەرکرد بەپێی ئەم بڕیارە سەرۆکو ئەندامانی ئەنجومەنی ڕاپەراندنو سەرۆکو ئەندامانی ئەنجومەنی یاسادانان دەسەڵاتی وەزیری خاوەن پەیوەندیان ئەبێ لە سنوری دەسەڵاتی خۆیدا .

بەراستی ئەم هەنگاوە گرنگە دەلالەتی قوڵو سەرتاپاگیرانەی هەیە ، بە تایبەتی ئەوەی کەیارمەتی دامو دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی ئەدات بۆ ئەوەی بتوانن لەسەر ڕێگای جێبەجێکردنی نەخشەکانی گەشەسەندنو پێشکەوتنی ناوچەکە بەهەنگاوی گەورە بەرەو پێشبچنو هەروەها تاوەکو دامو دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی بتوانن بۆ وەدیهێنانی ئاواتە ڕەواکانی ڕۆڵەکانی گەلەکەمان لەم ناوچەیەدا پێویستیو ئەرکی سەرشانی خۆیان ڕاپەڕێنن .

لە ئاداردا بەهارێک بۆ خەڵکی هەیەو شۆڕشی بەعسیش لەتەموردا بەهارێکی هەمیشەیی ژیانە .

د. کاڤان ظهیر احمد

# فاتمە محی‌الدین پەریی پێشڕەو و سەربازی نەناسراو



لە تەمەنی منداڵی‌یەوە هێند ناوی پەری‌و پەری‌زادەمان بیستووە کە هەر یەکەمان بە خەیاڵ وێنەیەکی دلگیری لە مێشکیدا بۆ پەری کێشابێت . پەریی رەحمەت لای هەموان ئافرەتێکی نەرم‌و نیانی رۆح‌سوکو سەر کلوی سپی‌یە . ئەوی دەیەوێت لە ژیاندا پەری‌یەکی وا بەچاوی خۆی ببینێت دەتوانێت بچێتە خزمەت فاتمە محی‌الدین کە بە داخەوە نەك سەرباز ، بەڵکو ئەفسەرێکی نەناسراوی تری کوردە . . .

تەمەنی لە ۸۰ تێپەڕیوە ، بەڵام سەرو سیماو قسەی زۆر لە ۸۰ کەمترە . قەت لەگەڵی بێ‌تاقەت نابیت ، هەگبەکەی پڕ داستانی مرواری‌و گەوهەری تریفەدارە . گەوهەرو مرواری‌یەکانی دانسقەو کەمهاوتان، بە ئارەقی پیرۆزی ناوچەوانو دڵسۆزی‌ی ناو قوڵایی گیانو شەونخونی‌و دەربەدەری‌و ژانی ژیانی کورد زاخاو دراون .

دەوروبەری سەدەیەك لەمەوبەر فاتمە لە شارێکی وەك بەغدا چاوی کردەوەو رێگەی قوتابخانەی «ئیتیحادو تەردقی»ی زانی . دور نی‌یە لەمەدا تاقانەی شاری سلێمانی بوبێت . شەڕ هەڵگیرساو زۆری نەبرد تەختو تاراجی دەوڵەتی عوسمانی تێکچوو فاتمەی دەستە کچ لەگەڵ باوکی کە تا ئەوسا کاربەدەستی دەزگای رێژی(۱) (وتن) بو گەڕایەوە نیشتمان .

**هەرزوو پەرەی دڵی ئەحمەد بەگی فەتاح بەگی شاعیر بەتیری عەشقی فاتمەی شۆخو شەنگ پێکرا . فاتمە کە خۆشی حەزی بە شیعر دەکرد(۲) کەوتە باخی شاعیرانو بووە میوانی دیوەخانی کوردپەروەران .**

زۆری نەبرد شێخ مەحمودی نەمر لاپەڕەیەکی پڕ شانازیی خەباتی گەلی کوردی تۆمارو ناوچەیەکی گرنگی نیشتمانی لە زوڵم‌و زۆری ئینگلیزی داگیرکەر رزگارکرد . ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ بووە وەزیری دارایی شێخ . فاتمەی ژنە وەزیر داخی ئەبەوەی ناچێت ئەریتی ئەوسای کۆمەڵ رێگەی ئەنەدا ئافرەت ئاگاداری هەموو شت بێت . بەڵام باشی لەبیرە چۆن زوربەی خەڵك دلخۆش‌و شەیدای سەربەخۆیی‌و ئەمانی مۆتەکەی مێجەرسۆن‌و پیاوەکانی بون . قەت ئەحمەد بەگی وا گورج‌و گۆڵ نەدیوە ، بۆ مزگەوتیش بوایە وای نەددکرد . بەر لەوە دڵی لە شێخ مەحمود رەنجابوو ، بەڵام بۆ کوردو خزمەتی پێشەوای هیچی لەدڵدا نەماو چاکی کاری لێ‌کرد بەلادا . زوو سکاڵای لەدەست ئینگلیزو پیلانی ئینگلیزخواکان دەکرد ، خۆزگەی ئەوە بو ئینگیز لە کورد بگەن‌و یاری‌و پەتی بەتێنی پێ نەکەن . سەرەتا رقی لێیان نەبو ، هیوای زۆر بوو یاریدەمان بدەن !

هەمو سەروەت‌و سامانی دەزگاکەی شێخ لە ناو قاسەی ژنی وەزیری دارایی‌دا بو . بە باجی توتن‌و گشت داهاتێکی ترەوە بە زەحمەت دەگەیشتە ۶۰ هەزار روپیە کە دەکاتە پێنج شەش هەزار دیناری ئەمڕۆکە(۳) ! ، کەچی هی واش هەبو ویژدانی خۆی دەخستە ژێر پێ‌و سەروەتی حەمە قەدۆی بەچەند روپیەیەکی کاربەدەستێکی بچوکی کورد دەپێوا . ئەو

سەروەلەش کە بوبووە تەحا تەحای چاو برسێکان بەهۆی دڵپاکی‌و ساکاری فاتمەوە لەگەڵ هەموو پاشکەوتی حەلاڵی ئەحمەد بەگ وەك هێلکەی پاك کراو کەوتە دەست ئینگلیزەکان . کە هێرشی ناکاویان هێنایە سەر شار فریای ئەوە کەوت تەنها ٢ لیرەی خۆیان بەرێت‌و قاسەکەی داخست‌و وەك خۆی بەجێی هێشت بەو هیوایەی زۆری پێ ناچێت دەگەڕێنەوە ... داخم ناچێت وا نەبو . مانگەهای مانگ ئەم دێ‌و ئەو گوندیان کرد . هەر زوو بیستیانەوە ئەوی هەیەو نی‌یە گورگەو سیك‌و چەتەی ناکەس بەچەی خۆمان تالانیان کردووە . کە گەڕانەوە شار ناچار ماوەیەکی باشیان بە کولەمەرگی بردەسەر ...

**پەردەیەکی تری ژیانی فاتمە کە تا مردن شانازی‌ی پێوە دەکات ئەوەیە کە یەکەم ئافرەتی کوردی عیراقە بووە مامۆستاو ٢٥ ساڵی رەبەقی ژیانی بە ئەوپەڕی دڵسۆزی‌یەوە بۆ پەروەردەکردنی صەدان کچ وەك کۆرپەی جگەر گۆشەی خۆی تەرخانکرد . بەدەست ئەو بوایە هەموو کچە کوردی فێری نوسین‌و خوێندنەوە دەکرد . ئەو پەردەیەی ژیانی پڕ لە بەسەرهات‌و سەرگوزەشتەی سەیرو پڕمانایە . وابزانم لاپەڕەکانی یەکەمی زۆر شایانی تۆمارن(٤) .**

ئێستەش لەو وایە ئەمرۆیە کە خوالێخۆش‌بو شێخ نوری شێخ سالحی شاعیرو خزمی ، خۆی کرد بە زوراو لە هەموو جار گەرمتر لەگەڵی کەوتە قسە. قەت وای نەدیبو . لەوەی دەکرد بۆ کارێك هاتووە زۆری مەبەستە . کەوتە باسی خوێندن‌و خوێندەواری‌ی‌و پیاهەڵدانی فاتمە کە دنیا دیدەیەو دەتوانێت رێگە نیشانی کەسانی‌تر بدات . گەلێکیش مەتح‌و سەنای ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگی کردو وتی زۆر حەز بە پێشکەوتنی کورد دەکات ... دوای ئەوەی شێخی شاعیر شانامەیەکی دورو درێژ بەقسەو لەبزی شیرینی بۆ فاتمەی ژن خوشکی دەخوێنێتەوە دێتە سەر مەبەست :

**«ئەحمەد بەگ نیازی‌یە قوتابخانەیەکی کچان لە سلێمانی بکاتەوەو لە گوزیدە خانی ژنی عەبدولعەزیز یامولکی‌و تۆ زیاتر کەس شك نابات پەنایان بۆ بەرێت . تەزویەك بە لەشمدا هات‌و کەوتمە دەریای خەیاڵەوە ... راستە خوێندن شتێکی چاکەو باوکم زوو زوو ئەمەی بە گوێماندا دەخوێندو خۆشم لە خێرو چاکە بەولاوە هیچی‌ترم لە خوێندن دەسگیر نەبوو ، بەلام ئاخۆ خەلکی شار چیمان پێ بلێن ؟ . لەسەر خۆ لەگەڵ شێخ نوری کەوتمە هەلسەنگاندنی مەسەلەکە ... راستێکەی هەرچەندم دەکۆشا زاتم نەدەکرد بەلێنی رازی بونی بدەمێ . بەلام ئەو کۆلی‌نەدا ، کەوتەوە هاندانم ، دەیزانی خوا پەرستم بۆیە زوو زوو ئایەت‌و حەدیسی تێکهەلکێشی قسەکانی دەکرد . بەهەشتی بە حۆری‌یەوە بۆ مسۆگەر کردم . وردە وردە نەرم بوم‌و گفتم دا . بەو جۆرە ، وەك بیرم بێت ، ساڵی ١٩٢٦ دەرگای یەکەم قوتابخانەی کچان لە سلێمانی کرایەوە . ئەحمەد بەگ بەناوی منەوە قوتابخانەکەی ناو نا «الزهراء»(٥) کە لە ناو خەلکدا (زەهرا)یان پێ دەگوت . شوێنەکەی نزیك مزگەوتی گەورە بو ، ئێستەش قوتابخانەی گولالەی کچانی تێدایە».**

گوزیدە یامولکی مودیرەو فاتمەش تاقە مامۆستای «زەهرا» بو . بە هەردوکیان سەرتاپای ئەو ئەرکەیان گرتەئەستۆ کە لەگەڵ ئەرکی ئەمڕۆکە زۆر جیاواز بو ... هەرچەند ناوی گوزیدە یامولکی د هات چاوەکانی پڕ دەبو لەئاو :

**«گوزیدە کوردی تورکیاو ئافرەتێکی کامل‌و تێگەیشتو بوو ، ماوەیەکی زۆر لە ئەستەمول ژیا بوو ، زۆر بەکوڵ خزمەتی دەکرد ، ئەوەندەی تر هانی منیشی دەدا . راستێکەی ئەو ئەبوایە لەوانە بوو ورە بەربدەم ، چونکە هەر زوو دەمی خەلکی دواکەوتومان لێ‌کرایەوە ، هەزارو یەك**



**ئـسەیان پێدەگوتین . ئـەوەیان لێ گردبونـە عەیبە کە کچەکان دوای هاتنە ژورەوەیان عەباو پەچەیان دادەگـــرت ! . قســـەی ئـەوەش خراپترمان دەبیستەوە . زۆر دایك بەترسەو لەرز کچەکانیان دەهێناو هەر ئەوە بوو کراسی قورئانیان بۆ لەبەر نەکەین تا دلنیابن ئاگامان لە شەرەفیان دەبێتو بە خوێندن لەکەدار نابن . دایکی وا هەبو پرسیاری ئەوتۆی دەکرد کە بۆ گێرانەوە ناشێت» .**

دایکی دلسۆزی کورد خۆی دایە دەم شەپۆلی رابوردوی سەیر ، بەلام خۆش :

**« یەکەم پۆلی قوتابخانـە سـاواکـەمان دەستەیەکی یەکجار سەیر بو . هی وای تێدا بو تەمەنی لە ٢٠و بروا بکە ٢٥یش تێپەربـو ، بە سەرو پێچی لارو لاگیرەو مێخەکبەنگو سورو سپیاوێکی باشـــەوە دەهات ، لەگـەل هی وا دادەنیشت بەکچی دەشیا . بەلام هـەمویان بۆ فێربون هاتبون ، بە دل خۆیان هیلاك دەکرد . هەژارو دەولەمەندیان تێدا بو . ئیستەش بیرمە جارێکیان پرتەقالم بۆ قوتابی‌یەکان بـرد ، هی وایان هەبو نەیدەزانی پرتەقال چی‌یە ، بۆنیـان پێوە دەکردو یاری‌یان پێدەکرد تا بە دەسـتی خۆم بۆم پاكو قاش‌کردنو تێم گەیاندن میوەیەو دەخورێت » .**

هەستێکی شاراوە قوتابـیو زیاتـر جوتـە مامۆستای زەهرایان دەبزواند . حـــەزیان دەکردو هەولیان دەدا هیچیان لـە کوڕانو پیاوان کـەمتـر نـەبێت . لێـرەدا دایکی کورد گوڕی دایـە خۆیو گەرمتر بوو ، لەوەی دەکرد بیەوێت من بـەلێنێت ، جا نازانم هەستی دەکرد کە من بە هەموو هۆشمەوە کەوتومەتە پـەرسـتگای دلسـۆزیو لـەخۆبوردنی پەری‌یەکی خاوێنی گەلەکەمان باوەڕ نا ؟. ئەوەیان گرنگ نی‌یە ، سەیرە وا نەبێت ، بەلام با لەبەر دلـە ناسکەکـەی ئـەو منیـش گوێ بدەمـە خـۆمو خۆم وریاترنیشـان بدەم :

« هەر ئەوەندە بیستمان فوئاد رەشـیـدی مامۆستای کوڕان شانۆگـەری «نیرۆنی زۆردار»ی پێشکەش کردووەو بەو کارەی هەستی زۆر کەسـی بزوانـدووە ئێمـەش هاتینە مەیـدانو ویسـتمـان مەنگاوێکی باشتر بنێین . بیری یەکێکمـان بۆ ئـەوە چـو کێشـەیـەکی ئـەوتۆی ناو کۆمـەلەکـەی خۆمان باس بکەین کە زۆر رۆژ توشی یـەکێك لـە قوربانی‌یەکانی دەهاتین . بەلام کەسمان دەستو زاتی نوسینمان نەبوو ، بۆیەکا پـەنامان بردە بـەر شـێخ نوریو ئـەویش لـەسـەر پێشـنیاری خۆمان شانۆگەری «دایك»ی بۆ ئامادەکردین. قوتابخانەمان رازاند وەو پەردەمان هەلواسیو نزیکەی حەفتەیەك زنانی شار روبان‌تێ‌کردینو بە پەرۆشـەوە سـەیری «دایك»یان دەکرد . بەبچەی خوشکم دەوری دایكو شـەفیقـە سـەعید(٦) کـە قوتابی‌یـەکی وریای قوتابخانەکەمان بو دەوری دوکتۆرەی بینی . دیار بو لەتەلی دلی بینەرانیان دەدا » .

تائیمـرۆش چ خۆی ، چ خوشـکی ناوەرۆکی «دایك»یان لەبیرە کە بەشێکی بەشیعر هۆنرابۆوە :

« دایکەی نەخوێندەوار بە هەلـە دەرمانێکـی مەتارەکان دەرخواردی کۆرپەکەی دەدات ، دەرمانـە دەبخاتە گیانەوە . هاوارو قیژەو گریەی دایکی کلۆل گەرەکی دێنێتە سەیر . یـەکێك لە سـەرسپی‌یـە ژیرەکانی دراوسێ بـەهەلەداوان خۆی دەکات بـە ژورداو دەپرسێت :

**چی‌یە ئەم گری‌یەو زاری‌یە**
**بۆچیتە هاوارو تەلاش ؟**
دایکە بە شیرزەیی :
**هەرگیز خەوی نەبوو منیش**
**چوم دامێ تۆزێك شیلەی خاش خاش**

دراوسێکەیان کە ئەمە دەبیسـێت دەسـتوبرد دەچێت بە دوای دوکتۆرەی شـاردا . دوکتـۆرە بەهەمان دەستور دەپرسێت :

**چی‌یە ئەم گری‌یەو زاری‌یە**
**بۆچیتە هاوارو تەلاش ؟**
**دایك ::**
**هەرگیز خەوی نەبوو منیش**
**چوم دامێ تۆزێك شیلەی خاش خاش**
دوکتۆرە :

**جا**
**کێ بەتۆی وت دەوایەکی زەریفو باشە**
**تیفلی وا قابیلی دەرمانی وەك خاش خاشە ؟**
**خێراکە ئەم دەرمانەی بدەرێ**
**بەلکو بەجارێك چارەی بکرێ**
**ئیتر هەرگیز لەو دەوایانەی نەدەیتێ**

دایك :

**تۆبە بێ ، تۆبە بێ یارەبی**
**هەتا ماوم دەرمانی وای نەدەمێ »**

گەروێژدانمان بێتو هەمو لایەنێی سەیری باسەکە بکەین ئەوا دانبەوەدا دەنێین لە یەکەم شانۆگەریدا ئافرەتمان بۆری پیاومانی داوە (٧ ... مامۆستای یەکەم ئەم قسانەمی بەدڵ بو . نەمویست لەوە زیاتر هیلاکی بکەم ، هاتە سەر وەلامی دو: پرسیارم :

« گوزیدە یامولکی سێ سال مودیرە بو . کە ئەو چووە بەغدا زەهرە خانی کچی مستەفا یامولکی بۆ دەورو بەری سێ سالێك چووە جێگەیو دوا بە دوای ئەو من بومە مودیرەو نزیکەی ٣٠ سال کاری ئەو قوتابخانەیەم گرتە ئەستۆ. روناکبیری ئەو سەردەمەی شارپشتیان دەگرتم بەقسەی پڕ هەستیان دلیان خۆش دەکردم . جارێکیان نزیك بەردەرکی سەرا یەکێك بە هیواشی دەستێکی دا بە پشتمداو پێی وتم :ئافەرین، هەزار جار ئافەرین ، سەرت بەرزکردینەوە ... کە ئاوڕم دایەوە پیرەمێردی شاعیرم دی . پیرەمێرد گەلێك قسەیتری کرد ، لەوە دەچو بیەوێت هەمو مالێك بکاتە قوتابخانەو بە دارعەساکەی بکەوێتە گیانی ئەو دایكو باوکانەی منداڵیان ناخەنە بەر خوێندن ... » .

دوا قسەی یەکەم مامۆستامان :

« ئیستەش هەرچەند چاوم کزو گوێم قورسو یادم کەم بووە ، بەلام گەز گەز بالا دەکەم کە دەبینم رەنجم بە فیرۆ نەچووەو کچە کورد چۆتە ریزی برایو شان بەشانی ژیانی نوێ بۆ نەوەی داهاتو دروست دەکات » .

سەربازو ئەفسەری نەناسراوی وەك فاتمەمان زۆرە ، با جارو بار یادیان بکەینەوەو هیچ نەبێت ، ئاکاتی خۆی ، پەیکەری پڕ شانازی‌یان لەقولایی دلو دەروندا بۆ داتاشینو شتی نەزانراوتویان لێوە فێربین تا لە کیسمان نەچون .

## پەراوێز :

(١) لە سەددی نۆزدەوە کۆمپانیای «رێژی»ی فەرەنسەیی بەرهەمهێنانو فرۆشتنی توتنی گشت ئیمپراتۆری‌ی عوسمانی‌ی گرتە دەست خۆی . «رێژی» وەك دەزگا لە سەرتاپای ئەو ولاتانەی کەوتبونە ناو دەولەتی عوسمانی‌یەوە بووە ناوێکی باو.

(٢) لەهەرەتی لاویدا شیعری بەتورکی وتووە .

(٣) ١٠٠ هەزار روپیە دەیکردە ٧٤٤٨ پاوەنی ئیستەرلینی .

(٤) تۆمارکردنی یادداشتی پێشرەوەکانی مێژوو ژیانی روناکبیریمان ئەرکێکی پیرۆزە کەوتۆتە ئەستۆی خاوەن خامەی دلسۆزی گەلەکەمان . ئەو یادداشتانە سەرچاوەی رەسەنی ئیمرۆو دوا رۆژمانە ، زۆریمان لەکیس‌چووەو کەمیمان ماوە . تا ئیستە چەند جارێك باسی ئەمەم کردووە . بەش بە حالی خۆم هەر دەرفەتێکم لەم بارەیەوە بۆ هەلکەوتبێت کەلکم لێ‌بینیوە . کاتی خۆی یادداشتەکانی خوالێخۆشبو مامۆستا ئیسماعیل حەقی شاوەیس تۆمار کرد ، خۆی رۆی ، ئەمیان باقی . بەشێك لە یادداشتەکانی مامۆستایان فوئاد مەستی‌و ئەحمەد خواجاشم نوسیودتەوە . هیوامە مایەی رەزامەندی‌ی بێتو ببێتە هاندەر بۆی تا ئەوەی ماوە لەکیس نەچێت .

(٥) لە (فاطمە الزهراء)ەوە .

**(٦) بهیجەمحی‌الدین‌و شەفیقە سەعیدیش دوو پێشڕەوی تری مەیدانی خوێندەواری‌ی ئافرەتی‌کوردن . صەدان کچە کورد لەسەر دەستی ئەوانو دەستە خوشکی ئەوان فێری خوێندنەوەو نوسین بون کە زۆریان پلەی بەرزی خوێندنیان تەواوکردووە .**

(٧) روناکبیرانی کوردی تورکیا بەهۆی چەند هۆیەکی تایبەتی‌و گشتی‌یەوە بەر لە ئێمە لە دەرگای زۆر هونەریان داوە . پێش شەری یەکەمی جیهان ئەوان شانۆگەری‌یان بەکوردی داناوە . لەگەل ئەوەش ئافرەتی کوردی عیراق لەم مەیدانەدا هەر یەکەمە .

## بەشی دووەم

# بارێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرین

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

وەك بینیمان د. نەبەز بە چاوێکی ئێجگار سووك تەماشای فەرهەنگی زەبیحیی کردووە ، بەلام لــە هــەمان کاتــدا فــەرهــەنگی عــەرەبی ـ کوردیی خوالێخۆش‌بوو ، گیوی موکریانیی نەبینیوە و کەچی بە ( مەزن ) پشی لە قەلەم دەدا . بەلگەی نەبینینیش، ئەوەیە کە ئەو فەرهەنگە عەرەبی ـ کوردی یەی بە کوردی ـ عەرەبی ناوبردووە ( بڕوانە : ل ٨٥ ) . . . من هەمیشە ڕێزی کاری هەموو کەسێکم گرتووە ، بەتایبەتی ئەرك و کۆششی مامۆستا گیوی موکریانی لە لام بایەخی زۆرە . بەلام ڕاستی و زانست بە هیچ چەشنێك بوارم نادەن کە ئەو ڕا سادە و ساکار و هەڕەمەیی‌یەی د. نەبەز پەسەند بکەم . خۆ ئەوەی کەمێك ئاگاداری ئەو دوو بــەرهەمە بێت ، بــەو هەلــەنگاندنە نەبەکامەی د. نەبەز قایل نابێ ، چونکە بێ‌گومان نە فەرهەنگەکەی زەبیحی : هەر لە لاپەڕەی یەکەمی‌یەوە لە سەر بنچینەی هەلە دامەزراوە (ل٨٧)و نە فەرهەنگەکەی گیوی موکریانی : مەزنە ( ل ٨٥ ) .

ئاشکرا دیارە کە ڕقـو کینەی لەخۆڕای د.نەبەز بەرانبەر بە کۆڕ و بــە زەبیحی ، خۆشەویستی و دۆستایەیەتی . . . . پشی لەگەل مامۆستا گیو تووشی ئەو هەلە گەوردیەیان کردووە ، کەچی هەر خۆشی زۆر جار لە وتارەکەیدا وا بە خوێنەر ڕادەگەیەنێ کە هاوڕێیەتی یا دۆستایەتی یا خزمایەتی یاخۆشەویستی نابێ ببێتە هۆی گۆڕینی ڕاستی . کەسێك خــۆی خاوەنی ئەو ڕاوێژە ڕاستە بێ و کەچی بەر لە هەموو کەس خۆی پەیڕەوی نەکات ، بێ‌گومان جێکەی لۆمە و ڕەخنەیە .

سەرەڕای هەموو ئەوە ، د. نەبەز لە باسی چاپ‌نەکردنــی فەرهەنگەکەی مامۆســتا گیــوی موکریانی‌یشدا ، هەر ناڕەوایانە بە بوختان بەرەنگاری کۆڕ بووە . نووسەری وتار وای نیشان داوە ، کە کۆڕ نەك هەر لە بلاونەکردنەوەی فەرهــەنگی ناوبراودا خراپی کردووە ، بەلکو « خراپتر ئەوەیە یەکسەر بە خاو نەکەشی نالێ برۆ بەرهەمەکەت بلاوناکەمەوە ، بەلکو چەنــد سالێك دەیهێنێ و دەیبا و دەستی دەستی‌ی پێ دەکا و وێنەی فەرهەنگەکەی دەگرێتەوە و بێ ڕازی بوونی نووسەرەکەی لای خۆی گلــی دەداتەوە و نایئێرێتەوە بۆی » ( ل ٨٥ ) . ئەمەی د. نەبەز وتۆیە بوختانە و لە ڕاستی‌یەوە دوورە ، چونکە کۆڕ نە دەستی دەستی‌ی بە مامۆستا گیو کردووە و نە وێنەی فەرهەنگەکەی گرتۆتەوە . . .

کۆڕ کۆششێکی ئێجگار زۆری بۆ لە چاپ‌دانی فەرهەنگی ناوبراو کرد ، بەلام هۆی نەگەیشتنە ئەنجام خوالێخۆشبوو گیوی موکریانی خۆی بوو و گەلێ کەسیش ئاگاداری ئەم ڕاستی‌یەن ، کەچی د. نەبەز و هەروەها د. کوردستانی کچــی خوالێخۆش بووش نــەچوونەتە ناخــی باسەکەوە و هاوڕێیەتــی و دۆستایەتی و خۆشەویستی کاری تێ‌کردوون ، بۆیە لە بریتی‌ی ئەوەی ڕێزی ئەو هەلۆێستە دلسۆزانەیەی کۆڕ بکرن ، بە گژیا چوون . ئەوە د. نەبەزی بەهەلەدا بردووە و تینی بە د. کوردستانیش داوە کە بە ناوی «نامەکانی کۆڕی زانیاری مل‌کەچن» ەوە وتار بنووسێ و هێرشی ناڕەوای تیادا بەرێتەوە سەر کۆڕ و قــەی سووکی پێ بلێ . . . (١٠) د. کوردستان لــەو وتارەیدا کە دەلێ : « نامەکانی کۆڕ ، کە پڕن لە بەلێن بۆ چاپ‌کردنی ( فەرهەنگی نۆبەرە ) ت وان لە لام » ( ل ٧ ) ، ئەوە بەلگەیە کە کۆڕ بەلێنی بۆ چاپ کردنی فەرهەنگی ناوبراو داوە و بۆ گەیاندنە ئەنجامی ئەو کارەش هەولی داوە . بەلام کە دەلێ : « مل‌کەچن ، چونکە خاوەنەکانیان ئێوەڕۆکی ئەو نامانەیان نەهێنایە

دی » ( ل ۷ ) ، ئەوە نەك هەر شێوازی نزمی گرتووە ، بەڵکو ڕاسپیشی نەکردووە ... نەدەبوو د. کوردستان هێندە پەلە بکا و هێندە هەڵەشە بێ ... بەداخەوە ئێرە جێی ئەوەنی‌یە کە تێکرای ڕاستی‌ی ئەو هەوڵ و تەقە لایەی کۆڕ بۆ لە چاپ دانی فەرهەنگی گیوی موکریانی داوێتی بخەمە پێش چاو . جا چاوەڕوانی ئەوەم کە د. کوردستان ئەو هەڕەشەیەی لە کۆڕی کردووە ( کە گوایا پەردە لە ڕووی ئەو نامانە هەڵدەداتەوە ) ، بێنێتە دی و ئەوسا منیش ڕاستی و دروستی بخەمە پێش چاوی دڵسۆزان و بەڵکو ئەوساش د. نەبەز لەو دوورەوە هەواڵی پڕوپووچ نەکاتە بوختان بۆ ئەو کۆڕەی لە یەکەم ڕۆژی دامەزراندنیەوە پێشرەوی خەباتی زانستانەی کورد بووە .

هەروەها با د. نەبەز ئەوەش بزانێ کە وێنەی ئەو فەرهەنگە نەگیراوەتەوە و کۆڕ پێویستی بەوە نەبووە و ئەگەر پێویستیشی پێی ببوایە ، بێ‌گومان بە بێ ڕازی بوونی خاوەنەکەی ئەو کارەی نەدەکرد ... جا با د. نەبەز ئەوە بزانێ ، کە ئەو جۆرە بوختانانە نرخی کۆڕی زانیاری کورد لە لای ڕووناکبیرانی دڵسۆز کەم ناکەنەوە .

★

د. نەبەز بێ هیچ لێکۆڵینەوە و لێدوا نێکی ئەوتۆ ئەو وتارانەی لە گۆڤاری کۆڕدا بڵاوکراونەتەوە، ڕەتددکاتەوە . هەر بەو چەشنەش دەربارەی نووسینەکانی من دەڵێ : « ئەمجا با بچینە سەر وتارەکانی د. ئەوڕەحمان حاجی مارف ، بە تایبەی وتارەکەی لە سەر لێکسیکۆلۆژیی زمانی کوردی کە وتارێکی یەکجار سادە و سەرەتایی و کاکۆلکەرانەیە . سەیر ئەوەیە لە لایەکەوە ئەو باسی ئێتیمۆلۆژی زمان دەکا ، بەڵام لە لایێکی دی‌یەوە و لە کاتێکدا کە وشەی ( هشك ) و ( وشك ) و ( ئەسپ ) و ( هەسپ ) لەپاڵ یەکەوە دەنووسێ ، کە ئەمەیان ڕاستە ، کەچی دەچێ لە هەمان کاتدا وشەی (دامێن) و ( داوێن ) و ( ما ) و ( مێ ) یش هەر لە پاڵ یەکەوە دەنووسێ و هەر وەك ئەوانەی پێشوو بە کوردی‌یان دەداتە قەڵەم و ئەمەش ناو دەنێ ( علم المفردات ) » ( ل ۹۱ ) ... ( داوێن ) کوردی‌یە و ( دامێن ) کوردی نی‌یە » ( ل ۹۲ ) .

ماکی ئەم باسەش هەر بوختان و ڕێزنەگرتن و وتەی سووکە . ناشکوری نەبێ ئێشمان هاتۆتە سەر ئەوەی کە هەر بوختان هەڵوەشێنینەوە و بڵێین جەناب ڕاستت نەفەرموو ... من باسی ( دامێن ) و ( داوێن ) م لە بەشی ( ئێتیمۆلۆژی ) ی وتاری « لێکسیکۆلۆژی‌ی زمانی کوردی » دا مەکردووە ، بەڵکو لە بەشی ( واتاناسی ـ علم معانی الالفاظ ـ Semasiology ) ی ئەو وتارەدا لێی دواوم ـ واتەلەبەشی دووەمدانی‌یە،بەڵکو لە بەشی یەکەمدایە. کەچی د. نەبەز بۆ مەبەستی بەهەڵەبردنی خوێنەر وای‌نیشانداوە کە ئەو باسەم لە بەشی(ئێتیمۆلۆژی)دا کردووە و پەنجەی بۆ بەشی دووەم ڕاکێشاوە ( بڕوانە : پەراوێزی ژ ۲۱ ، ل ۱۱۲ ) . جا هەر لەبەر ئەوەش کە بوختانەکەی زوو ئاشکرا نەبێ ، ژمارەی ئەو لاپەڕەیەی نووسینەکەی منی ناونەبردووە .

سەرەڕای ئەوە ، مەبەست و ناوەڕۆکی ئەو باسەی من کە د ربارەی ( دامێن ) و ( داوێن ) ە ، ئەوە نی‌یە کە د. نەبەز هەڵی بەستووە . لەو شوێنەدا من لە بارەی وشەی هاوواتا ( المرادف ـ Synonym ) وە کۆڵیومەلەوە ، وام داناوە کە ( دامێن ) و ( داوێن ) ئەو جۆرە وشانەن کە بە جیاوازی دەنگێك دەبنە هاوواتا ...(۱۱) جا د. نەبەز بیەوێ و نەیەوێ و ( دامێن ) نەك فارسی بێ ، بەڵکو ئەڵمانیش بێ ، کورد زۆر بەکاری دێنێ و لەگەڵ ( داوێن ) دا هاوواتایە . هەروەها تەنیا هەڵدانەوەی چەند لاپەڕەیەکی دیوانی نالی ، ئەو ڕایەی من دەچەسپێنێ و ڕای د. نەبەز ڕەت دەکاتەوە ، ئەویش لەبەر ئەوەی چەندین نموونە دەبینرێن کە وشەی ( دامێن ) یان تێدایە :

**ئەگەر خوێنم دەڕێژی تۆ ، ئەوە تێغو ئەمیش گەردن**
**ئەگەر بنیادی پەیمان ، دەستی من دامێنتە ، بازا !**
( نالی ، ن ۹٦ ) (۱۲)

**هودهودی دڵ حەبسی بەلقیسی سەبای دیوە ، یەقین**
**خۆی کە دامێن‌گیری شاهی ئاصەفی ثانی دەکا**
( ل ۱۰٥ )

**سەری فەرهادم و ، دەندووکی قولنگ**
**دەستی مەجنوونم و ، دامێنی چیا**
( ل ۱۲۷ )

**دامێنی بە ئەنواعی گوڵ و موڵ خەملابێ**

**گەنجێکـــی تێدا بێ کـــە طیلەســـمی نەشکابـــێ**
( ل ٦١٤ )

... هتد .

جا ئەگەر د. نەبـــەز خوانەخواستە ڕاستیش بوایە ، ئەوە نەدەبوو وتارێکی دوور و درێژ کە دواتر کردوومەتە کتێب و (١٢٧) لاپەڕە دەرچووە (١٣) ، وا بە بێویژدانی لە ســـەر بنچینەی بوختانێـــك و ڕەخنەیەکی نابەجێ ڕەتبکاتەوە و پێی بڵێ بەرهەمێکی « یەکجار سادە و سەرەتایی و گاگۆلکی کەرانەیە » . ئافەرین مامۆستا نەبەز ، ئاوا دەبێت پشتی ئەوانە بگریت کە دلـسۆزانە چاکی خزمەتی لێدەکەن بەلادا !!! هەرگیز نەبینراوە و نەبیـستراوە لە کتێبێکدا وشـەیەك بە ڕاست نەز نرێ ، بکرێتە بەلگەی بە خراپ دانانی ئەو کارە ... خۆ بێتوو پەیڕەوی ئەو حوکمە دوور لە زانـستە بکرێ ، ئەوە بەر لە هەموو کەس د. نەبەز خۆی بەردەکەوێ . بە وێنە هەر لەو وتارەیـــدا چەندین وشـەی بەکارهێناوە ، کە شـێوەی ڕاستریان هەیە ، وەك ( بەرامبـــەر ) کـــە ڕاستی‌یەکـــەی ( بەرانبەر ) ە ، ( ڕۆشـنبیر ) کە (ڕووناکبیر) کوردی‌ترە ... سـەرەڕای ئەوە هەستیش دەکرێ کە د. نەبەز لە هەندێ شوێنی نووسینەکەیدا بە کوردی بـــیری نەکردۆتەوە و ئەمەش گەلێ خراپترە . بۆ نموونە لە لاپەڕە (٨٠) دا دەستەواژەی ( شەڕی جیهانـــی‌ی یەکەم ) ی بەکارهێناوە ، کە وەرگێرانێکی دەقاودەقە لە عەرەبی‌یەوە. بەپێی‌سروشت‌و یاسای زمانی کوردی، دەبێ بووترێ ( شـەڕی یەکەمی جیهان ) ...

بێگومان ، من لەو وتانە هیچ دلگیر نەبووم ، چونکە حوکمی هەڕەمەیی و ناڕەوای د. نەبەز لـــە سـەرپاکی نووسینەکانی‌دا بەرانبەر بە ڕووناکبیران و زانایانی کورد هەر بەو چەشنەیە . تەنیا داخی ئەوە دەخۆم کە کردار و وتەی سـەر زاری خاوەنی چەند دوکتۆرایەك نێوانیان ئاسمان و ڕێسمانە .

من لە پێشـەکی کتێبی ناوبراودا نووسیومـــە : « هیچ گومانم لەوەدا نی‌یە ، کە ئەم کارەی من تەواو نی‌یە و کەم‌وکورتی‌ی تێدایە » (١٤) ، چونکە دەزانم کار نی‌یە لە ناتەواوی بەدوور بێ ، بەتایبەتی باسێك کە بۆ یەکەم جار کرابێ . جا بەداخەوە ، بەر لەو بەرهەمەی منهیچ شتێك‌دەربارەی«لێکسیکۆلۆژی»ی زمانی کوردی نەنووسراوە و منیش دوای هەوڵ و کۆششـێکی زۆر ، ئەوەی بۆم کرا کردم و لەئەنجامدا توانیم ئەو دیاری‌یە بچکۆلەیە پێشکەش بەنەتـــەوە خۆشەویستەکەم بکەم ... (١٥) کەچی د. ئەبـەز سەرەڕای بوختان و بێویژدانی و ڕێزنەگرتن ، هێشـتا بە زمانە « شـیرینەکەی » خۆی دەڵێ : « ئەمەش نێو دەنێ ( علم المفردات ) » ( ل ٩١ ) .

من لێرەدا خۆم بەو وتە جوانانەی د. نەبەزەوە خەریك ناکەم ، بەم ڕاستی‌یەك کە گشت لایـــەك ئاگادارینی ، ئەوەیە کـــە من هەمیشە بەگیانـــی لەخۆبوردنەوە و بێ خۆپەسەندی بەرهەمەکانـــم پێشکەش بەخوێنەران کردووە و لە تێکرای ژیانمدا باسی خۆم نەکردووە . گومـــانیشم نی‌یە ، کـــە نووسینەکانم بێ کەم‌وکورتی نین و هەروەها خۆم و خەڵك تەفرە نادەم و دەزانم شتی‌وا هەیە من نایزانم ... کەچی د. نەبەز زوربەی نووسینی هەر باسی زانایی و گەورەیی و ... خۆیەتی و لە گەلێـــك لاپەڕەدا تینوێتی‌ی خۆپەسەندی‌ی شکاندووە. لە نێو بەرهەمی زانـستی‌دا شتی ئەوتۆی لە بارەی خۆیەوە وتووە ، کە هیچ کەس ڕووی نایە لە باسی مێژووی ژیانیشـیدا بیخاتە سـەر کاغەز . بە کورتی هـــەر نووسینێکی ( جەماڵنامە ) یەکە بۆ خۆی . ئەو جۆرە نموونانە ئێجگار زۆرن و دوایی لێیان دەدوێم . جارێ تەنیا ئەوەیان دەخەمە پێش چاو کە لە باسی وتارەکانی گۆڤاری کۆڕدا وای داناوە،کە دەربارەی بەراوردکردنی دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی کوردی بە یەکدی ، لە بەراودکردنی جۆری دارشتنی وشـەکان و ڕستەکانی و جیاوازی‌ی دەنگەکان ، هەروەها گەڕان بە دوا وێنە ڕاستەکانیاندا ، بە پێی دەستووری زمانەوانـــی « دەلێم کە لەم ڕووەوە تەنیا یەك کار کراوە ، ئەوەش نامیلکەی ناوبراوی ( زمانی یەکگرتووی کوردی ) ی نووسـەری ئەم وتارەیە . لەوە بترازێ هـیچ جۆرە هەولێك نەدراوە و نەکـــراوە ... » ( ل ٩١ ) . شـــاردنەوەی ڕاستی‌و ڕێز نـــەگرتنی ئەرکی خەڵك لەلایەن د. نەبەزەوە لەوەدا دەردەکەوێ کە کتێبی « زمانی یەکگرتووی کوردی » بە تەنیا کار دادەنێ و دەشلێ « لەوە بترزێ هیچ جۆرە هەولێك نەدراوە و نەکراوە » . وەك ئاشکرایە لەم ڕووەوە ، هەندێ زانای کورد بەرهەمی چاك و زانستانەیان نووسیوە . جا لێرەدا لەسەر ئەم باسە ناڕۆم و بایەخی پـــێ نادەم ، بەلام دەمەوێ کەمێك لە ناوەرۆکی ئەو کارەی بدوێم ، کە بە لای خۆیەوە ئێجگار مەزنە .. بەداخەوە

ئەگەر بە کورتیش لەو کتێبەی د. نەبەز بدوێم ، بە لایەنی کەمەوە بە کتێبێك تەواو نابێ ، سەرەڕای ئەوەش هەر بـــە دەستمەوەیە لـــە دەرفەتێکـــدا هەڵی‌سەنگێنم . لەبەر ئەوە جاری بۆ نیشاندانی کەم و کورتی‌ی ئەو بەرهەمەی تەنیا ئەو باسانەهەڵدەبژێرم کە پێوەندی‌یان بە بەشە ئاخاوتنی ( ناو ) ەوە هەیە ، وەك : نێر و مێ ( ل ۲۷ ــ ۲۸ ) ، ئامرازی ناسینەوە ( کە ) ( ل ۲۸ ) ، ئامرازی کردنە گـــەل ( ل ۳۰ ) ، پاشگری نێوی تاك ( ل ۳۲ ) .

د. نەبەز لە سەرەتای باسی ( نێر و مێ ) دا نووسیوێتی ، دەڵێ : « شێوەی کرمانجی » زووررود بە پێچەوانـــەی کرمانجی نێوەڕاست ( مەبەستی کرمانجی خوارووە ــ ئەوڕەحمان ) ، وە وك زمانە ئێرانی‌یە کۆنەکان ، ڕەسەنی نێر و مێ لە یەك جیـــا دەکاتەوە » (۱٦) . هەرچەندەئەوەی د. نەبەز وتوویە ڕاستە ، بەڵام بۆ پێ‌سەلماندنی ئەو ڕایەی د بـوو لەو بارەیەوە کورتە گەشتێك بە زمانە ئێرانی‌یـــە کۆنەکاندا بکات و هەندێ نموونە بهێنێتەوە و هەروەها نیشـانی بدات کە چ گۆڕانێك ڕووی داوە .

نووسەر پاش دوو دێڕ و نیوی باسی (نێر و مێ) هاتۆتە سەر لێکۆڵینەوەی کێشـەی نێر و مێ لـــە دۆخی ئیزافەدا . لێرەدا ئـــەوەی دەستنیشـان کردووە کە لە دۆخی ئیزافەدا ئەگەر ( مضـاف ) مێ بێ نیشـانەی (ا) وەردەگرێ‌و ، ئەگەر نێر بێ نیشـانەی (ێ)ی پێوە دەلکێ . دواتریش دەڵێ : « ئەگەر دوا پیتی (۱۷) ( مضـاف ) پیتێکی دەنگدار ( حرف علە ) بوو ، وەك ( دا ) و ( برا ) ئەوە ئامرازی خستنەپاڵ دەبێتە ( یا ya ) ئەگەر ( مضـاف ) مێ بێ و دەبێتە ( یێ yê ) ئەگەر ( مضـاف ) نێر بێ ...» (۱۸) .

ڕاستە نووسەر بۆ ئەوە چووە کە لە دیالێکتی زووررودا لە حالەتی ئیزافەدا نیشانەی (ا) بۆ مێ و نیشانەی (ێ) بۆ نێر دەخرێتە پاڵ ( مضـاف ) ، بەڵام بە هیچ چەشنێك ناوی دوو نیشـانەی ( ە ) و (ی)ی نەهێناوە ، کە ئەمانیش لە دیالێکتی ناوبراودا ئیزافە سازدەکەن :

( ە ) ش هەر نیشـانەی ئیزافەی تاکی جینسـی مێ‌یە،بەڵام جیاوازی‌ی لەگەڵ نیشـانەی(ا)دا بەتایبەتی لەوەدایە کە ئەم کاتێك بە دیارخراوەوە دەلکێ کـــە نیشـانەی ( ەك )ی نەناسیاوی پێوە نەبێ ، وەك :

**ئەگەر چاڤێ تە کەتییە ل ڤیژەگـــە بەگ و غایێ**
**کوردانە ،**

( مەمێ ئالان ، ل٥٧ ) (۱۹)

**ئەوە دەری فەکر و دیت : ڤیژەك تێد ڕۆنشتییە**
**ل بەر وێ ژی تاژیکی زێری و کبوریشکەکە زێرین**
**ڤردا وێدا دڕەڤن**

( کوردۆ ، ل ۹۸ ) (۲۰)

**دبێژن وەڤەدکە کوردی**
**لە سەر زینات و ستەمکاریا ئەسەم**

( صەبری ، ل ٥٤ ) (۲۱)

هەرچی ( ی ) یشـە نیشـانەی ئیزافەی تاکـی جینسـی نێرەو هەر وەك (ە) ی نیشـانەی ئیزافەی‌تاکی جینسـی مێ،کاتێك بە دیارخراوەوە دەلکێ کەنیشـانەی ( ەك ) ی نەناسـیاوی پێوە بێ ، وەك :

**دەرمانەکی صیحەتو شیفایێ**
**مزگین و بەشارتا وەفایێ**

( خانی ، ل ۳ ) (۲۲)

**دەست و دانە هەڤ ب دلەکی گەرم تەڤ ئاگر و پێت.**

( صـەبری ، ١٤ )

**هۆزانەکی ژیر و زانایە بێداری**
**ب زارێ کوردی ئەم دکی زاری**

( جگرخوین ، ل ۱۲۹ ) (۲۳)

سـەرەڕای ئەو هەست نەکردنە کە بووەتە کەلێنێکی دیار لە بەشی دووەمی ئەم باسـەدا هەڵەیەکی گەورەش دەبینرێ ، ئەویش ئەوەیە کە نووسـەر وا تێ‌گەیشتووە کە ئەگەر دوا دەنگـــی ( مضـاف ) بزوێن بێ ، ئەوە نیشـانـەکانی ئیزافـەی (ا) و (ێ) دەبنـە ( یا ) و ( یێ ) . ڕاستی ئەوەیە کە لە زمانی کوردی‌دا دوو بزوێن بە یەکەوە نایەن ــ واتە بزوێن بە دوا بزوێندا نایەت . جا بۆ تێپەڕاندنی ئەو قۆرتە یا بزوێنێك تیادەچێ یاخود یەکێك لـەو دوو نیمچە بزوێنـــە ( ی ــ Y ، و ــ W ) دێتە گۆڕێ . بێتوو لە دۆخی ئیزافەدا دیارخراو کۆتایی بە دەنگی بزوێن هاتبێ ، ئەوە لەنێوان وشـە و نیشـانەکەدا نیمچەبزوێنی ( ی ــ Y ) پەیدا دەبێ . جا د. نەبەز کە لـەو حاڵەتەدا نیشـانەکان بە ( یا ) و ( یێ ) تێ‌گەیشتووە ، هەڵەیەکی زانستی‌ی گەورەی بە سەردا تێپەڕیوە .

پاش ئەوەی بە دە دێڕی پڕ کەم و کورتی‌و پڕ هەڵە لە باسی نێر و مێ لە دۆخی ئیزافەدا بووەتەوە ، ئنجا بە چەند دێڕێك باسی نێر و مێ‌ی لە ( دۆخی کەسی سێ‌یەم ) و لە ( دۆخی بانگهێشتن ) دا کردووە.

لەم شوێنانەشدا گەلێ هەڵە بەرچاو دەکەوێ .

ناتەواوی‌ی هەرە بەرچاو ئەوەیە ؛ د. ئەبەز باســـــی نێر و مێی لــــــە ( دۆخی تیــــــان ـ Oblique case )دا نەکردووە . وەك لێکۆڵینەوە دەری دەخا هەرچی یەکگرتنەوەی ناوی نێر و مێ‌یە لە دۆخی تیاندا یەکێکە لەو پردە هەرە سەرەکی‌یانەی دیالێکتەکان و بەشە دیالێکتەکانی زمانـــــی کوردی پێکــــەوە دەبەستێ . جا کتێبێك کـــــە مەبەسی دروستبوونی زمانـــــی یەکگرتووی کوردی بـــێ نەیتوانیبێ بە لای ئەو کێشە گرنگەدا بچێ ، ئیتر چۆن سەرکەوتوو دەبێ .

بێ‌گومـــان ، نزیکی‌ی نیشانــــەی نێر و مێ و یەکگرتنەوەی ناوی نێر و مێ لە دوخی تیانـــــدا ، دەتوانرێ بە یەکێك لەو بەڵگە زانستی‌یانە دابنرێ کە نیشانی یەکێتی‌ی زمانی کوردی دەدەن . بــــــۆ پێ‌سەلماندنی ئەو نزیکی و یەکگرتنەوەیەش . ئەگەر چاوێك بە زمانی کوردی‌دا بگێڕین ، دەبینین لــــە دیالێکتی کرمانجی‌ی ژووروودا جینســەکانی نـــــاو دەستوورێکی ڕێك‌وپێکیان ڕەچاوکردووە و لە ڕێگەی نیشانەوە لە یەکتر جیا دەبنەوە . لە دۆخی تیاندا جینسی مێ نیشانەی(ێ) وەردەگرێ و جینسی‌نێریش نیشانەی (ی)ی پێوە دەلکێ. لە بەشەدیالێکتی موکری و هەندی ناوچەی سۆران و کەمێك لە دەوروپشتی سلێمانی‌دا ، هەرچەندە وەك دیالێکتی کرمانجـــی‌ی ژووروو ڕێك‌وپێك خۆیان نانوێنن ، بەلام تا ڕادەیەك دەستووری خۆیان پاراستووە . لەم بەشە دیالێکتانەی خواروشدا هەر نیشانەی (ێ) دەچێتە سەر ناوی جینسی مێ‌و ، هەر نیشانەی (ی)ش ئیزافەی سەر ناوی نێر دەبێ . لە زمانی ئەدەبی و ئاخاوتنی سلێمانی وهەندێ ناوچەی‌تردا نیشانەی نێر و مێ ( جگە لە چەند حالەتێکی زۆر کەم نەبێ نەماوە ) .

دیارە ، ئاخاوتنی خەلکی ئەو مەلبەندانــــە و کەرەستەی تۆمارکراویان بەڵگەی واقیعی و لەبارن لە چەسپاندن و گەشەپێدان و پێشخستنی کێشەی لێکۆڵینەوەی جینســەکانی ناودا . جا بۆ پێ‌سەلماندنی ئـــەو وشـــانـــەم گـــەشـــتێك بـــــە دیالێکتـــەکان و بەشەدیالێکتەکانی زمانی کوردی‌دا دەکەم

١ ــ لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا .

نمونە بۆ ناوی جینسی مێ :

**دو ڕەشماران سەمەن سوڕ بوو**<br>
**مە دل مابوو د خیالێ‌دا**

( جزیری ، ل ٥٤٤ ) (٢٤)

**پەروەردە ب کی ب ئاڤیتابێ**<br>
**هەردەم ب ڕەشینی لێ گولابێ**

( خانی ، ٤٤٦ )

**یەك ئارمانج**<br>
**یەك ڕێزان**<br>
**یەك ڕامان**<br>
**خەباتێ بکی**<br>
**ژ بۆ کوردستان**

( سەبری ، ل ٦٧ )

**ل سەیدا گوە بدێرە ئەز بێژم**<br>
**چەند دلۆپان ژ خەمێ ب ڕێژم**

( جگرخوین ، ل ١٢٨ )

... هتد .

نموونە بۆ ناوی جینسی نێر :

**ب خدمەت عەرضی سولطانی**<br>
**عەبیر و عەنبەر ئەفشان بت**

( جزیری ، ل ٥٤١ )

**گاڤا کو دچینە نێڤ مەزاری**<br>
**دا خەلقی نە بێژن ب زاری**

( خانی ، ٣٩٢ )

**وەکی مێران دەست بدە خوە**<br>
**وی شووری هلدە ڕاست و چەپ داوەشینە**

( صبری ل ٦٠ )

**وان دل ب کوڵ و دەردان**<br>
**ژ بلی ڤە خۆە بەردان**

( جگرخوین ، ل ١٧٥ )

... هتد .

ئەو نموونانەی سەرەوە ئەوە دیاردەخەن ، کە نیشانەی ( ێ ) و ( ی ) لە دیالێکتی کرمانجـــی‌ی ژووروودا دەوری جیاکردنەوە ونیشانەدان جینسی‌ناو دەبینن . بە وێنە لە ڕستەی « ئەز چووم نـــــك ئەحمەدی »دا ، وشەی ( ئەحمەدا ) لەبەر ئەوەناوی جینسی‌نێرە ، نیشانەی ( ی ) وەرگرتووە.بەلام ئەگەر وشەی ( ئەسرین ) کە ناوی کچە لە جێی ( ئەحمەد ) دابنرێ ، ئەوە نیشانەی ( ێ ) وەردەگرێ و دەوترێ « ئەز چووم نك ئەسرینێ » ... لە ڕستەی « ئەز مریشکێ کرم » دا نیشانەی (ێ) بە وشەی (مریشك) ەوە لکاوە ، چونکە ناوی جینسی مێ‌یە ، بەلام بێتوو

وشەی ( دیکل ) کە ناوی جینسی نێرە بخرێتە شوێنی وشەی ( مریشك ) ، ئەو کاتە نیشانەی ( ی ) دێتە ناوانەوە و دەوترێ « ئەزێ دیکلی کرم » ...

٢ ـ لە دیالێکتی کرمانجی خواروودا

ا ـ لە ناوچەی موکریان

گومان لەوە ناکرێ کە لە کاری ساغکردنەوەی کێشەی نێر و مێ لە بەشەدیالێکتی موکریدا کتێبی « تحفەء مظفریة » (٢٥) باشترین سەرچاوەیە . لە تەماشاکردنێکی ناوەرۆکی کتێبی ناوبراودا جینسەدان ناو ئاشکرا دەبێ . بۆ پێسەلماندنی ئەو مەبەستە هەندێ ڕستە لەو نووسراوەوە دێنمەوە

نموونە بۆ جینسی مێ :

**ئەمن دەزانم کاکەمەم دەگەڵ یایەزینێ دە دیوانێ خەوی لێ کەوتووە .**

( ب ١ ، ل ٣١٢ )

**لەوێ چاوی بە خەزاڵێ مەلا نەبیان کەوتبو**

( ب ١ ، ل ٣١٥ )

**خان ئەحمەد خان شکا چوو بۆ ئەستەمبوولێ**

( ب ١ ، ل ١٧٩ )

**... بە کوردستانێدا هات ...**

( ب ١ ، ل ١٧٩ )

**... هتد .**

نموونە بۆ جینسی نێر :

**قاسد سبحەینێ هەڵستا ، دەرکیان لێکردەوە چووە کن خانی ، کاغەزی دا بە خانی**

( ب ١ ، ل ١٨١ )

**ڕێوێیێك چووە کن کەڵەبابی**

( ب ١ ، ل ١٩٢ )

**لە سەر کۆشکی کاکەمەمی ...**

( ب ١ ، ل ٢٢٥ )

**گوتی دەتانبەمە کن سولتانی**

( ب ١ ، ل ١٨٧ )

**... هتد .**

لە گەشتی کتێبی « تحفەء مظفریە » دا گەلێ جار ئەوە دێتە بەرچاو کە لە یەك ڕستەدا بە ئاشکرایی هەردوو جینسەکە خۆیان بنوێنن . بە وێنە کە لە لاپەڕە (٢٣٤)ی بەرگی یەکەمدا وتراوە : « دایکی لاسی نێوی شەمێ بوو » ، ئەوە گومان ناکرێ کە ( لاس ) ناوی نێرینەیە ، وە ( شەم ) یش ناوی مێینەیە . جا هەر لەبەر ئەو هۆ و یاسا و دەستوورە ڕەچاوکراوەیە کە ( لاس ) نیشانەی ( ی ) ی پێوە لکاوە و ( شەم ) یش نیشانەی ( ێ ) ی وەگرتووە . یاخود کاتێ کە حیکایەت خوان وتۆیە : « شاعەبباس لە ئێسفەهانێ لە شکری نارد بۆ سەر خان ئەحمەدخانی ... » ( ب ١ ، ل ١٧٩ ) ، ئەوە ئەگەڵ وشەکانی ( ئیسفەهان ) و ( خان ) دا بە گوێرەی جینسەکانیان موعامەلەی لەگەڵ کردوون واتە نیشانەی ( ێ ) ی بە وشەی ( ئیسفەهان ) ەوە لکاندوە ، چونکە لە جینسی مێیە ، وە لەبەر ئەوەی وشەی ( خان ) ناوی جینسی نێرە نیشانەی ( ی ) خستۆتەسەر ..

ب ـ لە ناوچەی سۆران .

لە ڕوونکردنەوەی کێشەی نێر و مێ لە بەشە دیالێکتی سۆراندا ناودرۆکی کتێبی « فۆلکلۆری هۆنراوەی کوردەواری » (٢٦) کەرەستەیەکی بێهاوتایە و منیش دەیکەمە سەرچاوەی ئەم بەشەی باسەکەم .

نموونە بۆ جینسی مێ :

**جانم عەیشۆکێ ئۆمەری**
**گوڵێ ڕۆیی لۆ ئەوبەری**

( ل ٤٠ )

**لە دونیایم لۆ نەبووی**
**چت لێ بکەم لە قیامەتێ**

( ل ٩٤ )

**بای شەمار بە هاوینێ**
**دەیدا لە ڕەندی جۆخینێ**
**خەو خۆشە لەگەر ئامینێ**

( ل ٢٩ )

**سینگ ماڵۆری خۆراسان**
**هێنام لە لای لاجانێ**

( ل ٣٣ )

**... هتد .**

نموونە بۆ جینسی نێر :

**برینی گامیشی**
**بەردان دەقەڵێشی**

( ل ٢٠٣ )

**بووکی مارێ میری**
**بردیان لۆ یەخسیری**

( ل ٢٠٣ )

**چاوت وەکی چاوی ماری**
**خۆت لۆم باوێ سەر دیواری**

**ماچت دەکەم پڕ بە زاری**

( ل ٦٠ )

**چایەکی یەکڕەنگی دامێ**
**ناویش لە سەماوەری**

( ل ٨٠ )

... هتد .

چۆن لە کتێبی « تحفەء مظفریە » دا ، هەروەها لە کتێبێ « فۆلکلۆری هۆنراوەکانـــی کوردەواری » شدا ڕستەی ئەوتۆ دێتەبەرچاو کە هەردوو جینســەکە خۆیان تێدا نواندووە .

بە وێنە :

**بە سەری شێخ حوسێنی**
**ئاوێ لۆ کەپرێ دێنی**

( ل ٩٠ )

**نوشتێیەکمان کرد بە مەلای**
**بابت بچێ لۆ دەشتێ**

( ل ٧٦ )

... هتد .

ج ـ لە ناوچەی سلێمانی

هەندێ پەندی پێشینان هەن،کەنیشانەی (ێ)ی جینسی مێیان تێدا بەدی دەکرێ. جا ئەو (ێ یەی لەو پەندانەداخۆی نواندووە لەوە دەچێ پاشماوەی جنسی مێ بێت لە بەشـە دیالێکتی سلێمانیدا :

**دشی دشێ ، بەچی دەچێ**

( پەندی پێشینان ، ل ٢١٦ ) (٢٧)

**لە گەورە گەورەی پشەمەرێ هۆمان گەوتە قـــوون مزە هاجەرێ .**

( ل ٣٥٤ )

**ژن لە ساچێ ، مێرد لە حەجێ پێکەوە گەیشتنە جێ .**

( ل ٢٦٤ )

... هتد (٢٨)

دەربارەی جینسـەکانی ناو گەلێ زانیاریی تر هەن و بەداخەوە لێرەدا مەودای لێدوانیان نییە ... کێشەی جینسـی لە زمانی کوردیدا کە باسێکی‌ئێجگار فراوان و بەرینە ، پێویستی بە چەندین لێکۆڵینەوەی تەواو و زانستانەیە ، کەچی لە ، کتێبی « زمانـــی یەکگرتووی کوردی » دا کەمێ پتر لە لاپەڕەیەکـی گرتۆتەوەو سەرەڕای ئەوەش کەم و کورتی و هەڵەی زۆری تێدایە . لە ئەنجامدا پەنجە بۆ ئەوە ڕادەکێشم، کە ئەو چەند دێرە پڕ هەڵە و ناتەواوییەی د. نەبەز لە بارەی ( نێر و مێ ) وە نووسیویەتی ، نەك هەر شتێکی ئەوتۆ نییە ، بەڵکو نیشانیشی نەپێکاوە .

بە تەواو بوونی باسی ( نێر و مێ ) لە باسی ( نیشانەی ناسیاوی ـ ەکە ـ ) دواوە ، کـە لە ژێر سەرباسی « ئامرازی ناسینەوە ( کە ) » دا جێی کردۆتەوە ( ل ٢٨ ) . ئەم بە شەش هەر وەك باسی ( نێر و مێ ) پڕ هەڵە و ناتەواوییە . تێکڕای ئەو چەند دێرەی لەو بارەیەوە نووسیوێتی پێویستی بە پێداچوونەوەیە . ئێستاش بۆ زێدە ڕوونکردنەوە با تەماشای ئەو چەند دێرە بکەین کـــە د. نەبـــەز نووسیوێتی :

« ئامرازی ناسینەوە ( کە ) ـ اداة التعریف ( کە ) ئەگەر بمانەوێ لە شێوەی کرمانجی نێوەڕاستدا نێوێکی نەناسراو ( اسم نکرة ) بکەین بە نێوێکی ناسراو ( اسم معرفە ) ، ئەوە تەماشای دوا تیپی وشەکە دەکەین ، ئەگەر هاتوو بە تیپێکی بێ‌دەنگ کۆتایی هاتبوو ، ئەوا پاشگری ( دکە **eke** ) دەخرێتە پاڵ وەك بەرد ـ بەردەکە ( بەرد + ەکە ) . خۆ ئەگەر دوا تیپی وشەکە دەنگدار بوو ئەوا یا پاشگری ( کە **ke** ) یا ( یەکە **Yeke** ) ی دەخەینە پاڵ » ( ل ٢٨ ) .

هەرچەندە بەرانبەر ئەو وتانەی نووسەر هەندێ تێبینیی لاوەکیم هەیە ، بەڵام لێرەدا تەنیا لەوانە دەدوێم کە پیوەندییان بە باسەکەوە هەیە :

١ ـ لە سەرباسدا نووسەر بە ( ەکـــە ) ی وتووە ئامراز و دواتر بە پاشگری داناوە . پێویستە ئەو ڕاستییە لە بیر نەکەین کە ( دکە ) لە ڕووی ڕێزمانەوە نیشانەیە (٢٩) .

٢ ـ نووسەر لە سەرەتاوە بە هەڵە چووە کـە نیشانەی ناسیاوی بە ( کە ) ناوبردووە ... هەڵەی گەورەتریشی ئەوەیە لە دواتر ( کە ) و ( ەکـە ) و ( یەکە ) ی بە سێ پاشگر داناوە . گومان لەوەدا نییە کە نیشانەکە ( دکە ) یە ، نەك ( کە ) یاخود ( یەکە ) . ( ەکە ) و ( کە ) و ( یەکە ) سێ نیشانەی سەربەخۆ نین ، بەڵکو تەنیا ( ەکە ) یە و بە پێی دوا دەنگی وشە گۆڕانی بە سەردا دێت ، کە ئەمەش دیاردەیەکـــی ئاشکرای فۆنەتیکی زمانی کوردییـــە . سەرەڕای ئەوە نووسەر لەوە نەدواوە کە ئەگەر وشەیەك کۆتایی بە بزوێنی ( وو ) بێت چ گۆڕانێك دێتە گۆڕێ .

٣ ـ لێرەدا باس لـە ( دەنگ ) دەکرێ ، نـەك ( بیت ) . لەم شوێنەشدا د. نەبەز خراپ ئەو دوو

مەفهومەی تێکەڵکردوو .

٤ ــ لە زمانی کوردیدا جگە لە ,ەکە) ، هەروەها (ە)ش نیشانەی ناسیاوی‌یە ، بەڵام د. نەبەز لە هیچ شوێنێکدا ناوی نەبردووە و دیارە دەرکی بە بوسی نەکردووە (٣٠) .

... و هەندێکی‌تر .

ئەگەر بۆ ساغکردنەوەی کێشەی نیشانەی ناسیاوی ناوڕ لە پەنجا ساڵێك لەوبەر بدەینەوە و تەماشای ئەو باسە لە کتێبی « دەستووری زمانی کوردی » ی مامۆستا توفیق وەهبی‌دا (٣١) بکەین ئاشکرا دەبینین کە لە هەموو ڕوویەکەوە مامۆستا وەهبی لەوەی د. نەبەز زانستانەتر و قووڵترە . کەچی د . نەبەز ئەك هەر بە شێوەیەکی ساکار لەو باسە دواوە ، بەڵکو هەڵەی زۆریشی کردووە . بۆیە ئەگەر لەباریدا نەبووە بەرهەمێکی نوێ بێنێتەئەنجام ، باشتر وا بوو ، هەر ئەوەی مامۆستا وەهبی دووپات بکاتەوە ... دەتوانم بەوپەڕی دڵنیایی‌یەوە بڵێم د. نەبەز لە باسی ئەو کێشەیەدا نەك لێکۆڵینەوەیەکی پەنجا ساڵ لەمەوبەری لە کەو نەداوە و گەشەی پێ نەکردووە و پێش نەخستووە ، بەڵکو شێواندووشێتی وپەردەی بە سەردا داودو بەرەو دواوەی گێڕاوەتەوە. بێگومان شتی وایش لە زانستدا ڕەوا نی‌یە .

لە لاپەڕە (٣٠)دا زۆر کورت بە ناوی « ئامرازی کردنە گەل»ەوە دەربارەی کۆ دواوە . نووسەر ڕاست بۆ ئەوە چووە کە (ان)ی لە هەردوو دیالێکتە سەرەکی‌یەکەی کوردی‌دا بە نیشانەی کۆ داناوە . بەڵام بەداخەوە ئەم بەشەش بێ هەڵە و کەموکورتی نی‌یە :

جگە لە (ان)ی نیشانەی سەرەکی کۆ ، لە زمانی کوردی‌دا چەند نیشانەیەکی دیکەش ، وەك : (ا ت) ، (ەها) ... هەن و نووسەر ناوی نەهێناون . هەرچەندە لە پەراوێزی ژمارە (٤٢)دا ناوی (گەل)ی بردووە ، بەڵام هەڵەی ئەوەیە ، وای داناوە کە ئەو نیشانەیە تەنیا لە بەشە دیالێکیتی ئەردەڵاندا بەکاردێ و بۆ نموونەش «کوڕگەل»ی هێناوەتەوە . ڕاستە مۆرفێمی (گەل) لە بەشە دیالێکیتی ئەردەڵاندا نیشانەی کۆیە ، بەڵام نابێ ئەوە لە بیر بکرێ کە تا ڕادەیەك لە هەندێ بەشە دیالێکتی‌تردا دەبینرێ ، بەتایبەتی لەزمانی ئەدەبی‌دا . بە وێنە هەر ئەو وشەی (کوڕگەل)ەی د. نەبەز بە نموونە هێناویەتی‌یەوە ، بەم جۆرەی خوارەوە لە شیعرێکی گۆراندا دەبینرێ :

**کوڕگەل : هەمیشە گیان و دلشاد بن**
**دەست لە ملانی بووکی مراد بن**

(گۆران ، ب ، ل١٧٣)(٣٢)

هەروەها ئەو نموونانەی خوارەوەش هەندێ بەڵگەی ترن که تیایاند (گەل) دەوری کۆکردنەوەی بینیوە :

**گاگەل بە گردەوە ڕۆی ، پیرێژن تۆلکە سووری نەپێچایەوە .**

(پەندی پێشینان ، ل٣٦١)

**گورگ کە پیر بوو ئەبێ بە مەخسەرەی سەگگەل.(٣٣)**

(پەندی پێشینان ، ل٣٦٧)

**چیفێکی کۆنی پڕ لە چڵك و تۆز**
**کە بۆ کارەگەل کرابێت بە کۆز**

(پیرەمێرد ، ل٢٧٣)(٣٤)

... هتد .

لە باسی نیشانەکانی (ێن) و (ێد/ێت)ی کۆی ئیزافەدا جگە لەوەی کە (ێد) و (ێت)ی وەك دوو نیشانەی تەماشا کردووە ، هەروەها بێ هیچ بناغەو بەڵگەیەکیش وای داوەتە قەڵەم کە (ێد) تەنیا نە بەشە دیالێکتی کوردی سۆڤیەتدا بەکار دێ . بەڵام تەماشاکردنێکی سەرپێیی «مەم و زین»ی ئەحمەدی خانی یەکسەر ئەو ڕا ساکارەی د. نەبەز ڕەت دەکاتەوە ، چونکە دەیان نموونە دەبینرێن کە (ێد)ی نیشانەی ئیزافەی کۆیان پێوە لکاوە ، وەك :

**مەحبووبە لیباس و گۆشوارە**
**ملکێد منن نە موستەعارە**

(خانی ، ل٧٦)

**نابێ عیظام و جەدد و والید**
**مەنسووب و مسەلسەلێد خالید**

(خانی ل٨٠)

... هتد .

سەرەڕای ئەوانەش ، هەروەها لە هەندێ بەشە دیالێکتی ژووروودا چەند نیشانەی دی‌هەن ، نووسەر ناوی نەهێناون(٣٥) .

لە ژێر سەرباسی «پاشگری نێوی تاك»دا (ل٣٢) دەربارەی نیشانەی (ێك) دواوە . لێرەشدا هەڵە و ناتەواوی زۆر دەبینرێ . بەوێنە :

١ ــ نووسەر وا تێگەیشتووە کە نیشانەی ناوبراو تەنیا تاکایەتی نیشان دەدا و بۆ ئەوە نەچووە کە ناسیاویش دەگەیەنێ .

٢ ــ د. نەبەزلێ رەشدا ئەو نیشانەیەی هەر بە پاشگر داوەتە قەڵەم و هەروەها مۆرفێمی (یەك) کە شێوەی مۆرفێم( Allomorph )ی (ێك)ە بە پاشگرێکی سەربەخۆی داناوە .

٣ ــ سەرەڕای ئەوانە نووسەر ناوی نیشانەی (ێ) و (ە)شی نەبردووە(٣٦) .

...هتد .

ئەوەی لە سەرەوە لێی دوام ، هەندێ سەرنج و تێبینی بوون دەربارەی ئەو باسانەی لە کتێبی « زمانی یەکگرتووی کوردی »دا پێوەندییان بە بەشە ئاخاوتنی (ناو)ەوە هەیە . جگە لەو هەموو کەموکورتی و ناتەواوی و هەڵانەی نووسەر ،ڕەخنەیەکی بنەڕەتی دێتەگۆڕێ ، ئەویش ئەوەیە کە بە دوو لاپەڕە و نیو بە سەر ئەو چەند باسە گرنگەدا تێپەڕیوە .

جا ئەمەیە ئەو کتێبەی نووسەرەکەی هێندە شانازیی پێوە دەکات و هەموو بەرهەمێکی دیی دەکاتە قوربان ... بەڵام من چونکە ویژدانم پاکە و حوکمی نارەوا نادەم ، بۆیە دەڵێم : لەگەڵ هەموو ئەوەشدا کتێبی ناوبراو کەرەستە و زانیاریی باشی هەر تێدایە.

بەداخەوە ، خۆپەسەندی و نرخنەزانینی کاری خەڵك لە لای د. نەبەز گەیشتووەتە ئەو ڕادەیە کە ئەو کتێبەی خۆی بە تەنیا کار بزانێ و هەرچی لە کۆڕیش کراوە بە هیچ و پووچ و پێی بڵێ : « ئەم هەموو قسە زل و پف هەڵداراوانە دەکرێن و ئەم هەموو کاغەزە سپییە جوانە ڕەش دەکرێنەوەو ئەم هەموو پارە زۆرە تەخش و پەخش دەکرێن ، کەچی تەنیا یەك کار لەم بارەیەوە دیارە ، ئەویش ئیشی کابرایەکی دوور وڵاتە کە کۆڕ لە (ڕووی پیاوەتی)یەوە خراپەکاریی لەگەڵدا دەکات »(ل٩١) . دەبێ ئەو بێویژدانییە تا چ ڕادەیەك بێ کە ئەو هەموو بەرهەمە بەنرخەی کۆڕی بە قسەی زل و پفهەڵدراو دابنێ ؟ هەموو دڵسۆزێك دەزانێ کە کۆڕی زانیاری کورد گەلێ کاری زانستانەی گەورە و گەلێ نووسینی شاکاری کەموێنەی بڵاوکردتەوە . ئەوەی لەم چەند ساڵەی دواییدا بەرچاو بێ ، ئەوەیە کە ئەم دەزگایە ، لە زۆر ڕووەوە پێشڕەو بووە و لە مێژووی ڕووناکبیری و زانستی گەلی کورددا جێگای بەرزی شایان و پڕ شانازیی وەرگرتووە ... ئەگەر خۆهەڵکێشان و جوێن بەخەڵکدان و ڕێزنەگرتنی دڵسۆزان و بێویژدانی ... د. نەبەز بە زانست دابنرێن و بە نۆفسێت چاپبکرێن و ڕەنج و ئەرك و دڵسۆزی و شارەزایی ئەو نووسەرانەی کۆڕ بەرهەمی بۆ چاپکردوون ڕەشکردنەوەی کاغەزی جوان بن ، ئەوە دەبێ هەزار خۆزگە بە کفندز بخوازرێ .

دیارە د. نەبەز هەر دەیەوێ دوژمنایەتیی کۆڕ بکا ، ئەگینا ئەو پارە زۆرەی تەخش و پەخش دەکرێ کامەیە ؟ ... کێ هەیە ئاگاداری ئەوە نەبێ کە بوودجەی کۆڕ لە هەموو دەزگایەکی کوردی زۆر کەمترە ؟ ... مەسرەفی ساڵێکی ئەو گۆڤاری «ئاسۆی زانکۆیی»یەی ئەو تێیدا قسە بە خەڵك دەڵێ ، گەلێك لە هەموو بوودجەی کۆڕ پترە ... بە لەخۆبووردنی ئەوانەی د. نەبەز هێرشیان دەباتە سەر نەبوایە نە ئەو هەموو کارە دەکرا ، نە ئەو پارە کەمە بەشی دەکرد . ئەندامان و فەرمانبەران و دۆستانی کۆڕ هیچ دەمێك چاویان لە پارە نەبووە ، بەڵکەشئەوەیە کە مووچە و پاداشتلەهەر دەزگایەکی دیکەی دەولەتدا گەلێك پترە ، کەچی زوربەی هەرە زۆری خەڵك هەر ڕووی لە کۆڕ کردووە . تێکرای گۆڤارەکان بۆ پاداشتی وتارێك پارەیەکی باش دەدەن بەڵام گۆڤاری کۆڕ تا ئەم چەند مانگەی دواییش ڕادەی هەرە بەرزی پاداشتی وتار (٣٠) دینار بوو ... ئەمەیە ڕاستی و با بزانین کێ چاوی لە پارەیە : د. نەبەز لە کۆتایی لەو نامەیەدا کە لە ای مایسی ١٩٧٨ دا بۆ مامۆستا مەسعوود محەمەدی نووسیوە ، دەڵێ « تکایە پاردی ئەو وتارەی کە لە گۆڤاری کۆڕدا نووسیومە و تا ئێستە نەتانداوە بە زووترین کات بێنێرن بۆ دایکم . ئەوەش بزانن وتارەکە لە دوو جێدا بڵاوکراوەتەوە . ١ ــ لە گۆڤارەکەدا . ٢ ــ لە نامیلکەیەکی تایبەتیدا . لەبەر ئەوە هەر لاپەڕەیەکی دەکاتە پێنج دیناری عیراق » . ئەگەر د. نەبەز بۆ هەر لاپەڕەیەکی وتارەکەی داوای (٥) دینار بکات ئەوە وتارەکەی کە (٨٦) لاپەڕەیە دەکاتە (٤٣٠) دینار . جا کۆڕ بۆ تێکڕای وتاردکانی ئەو ژمارەیەی گۆڤارەکەی کە پتر لە (٩٥٠) لاپەڕەیە هێندەی پاداشت نەداوە کە د. نەبەز بەتەنیا داوای دەکات . کەچی هێشتانەویش دەیەوێ نیشانی بدا کە دڵسۆزە و بەزەیی بەوەدا دێتەوە کە کۆڕ پارەی زۆر « تەخش و پەخش » دەکات .

زۆر لە دڵسۆزان نەك هەر ئەو چەند دینارە کەمەی پاداشتی وتار،بەڵکو پارەی گەلێ ئەرکی ڕەوای

خۆیان بە کۆڕ دەبەخشن،ئەویش بۆ ئەوەی بەو پارانە بتوانرێ پتر بەرهەمی کوردی چاپ بکرێ و خزمەتی ئەم گەلە هەژارەمان بکرێ . کەچی د. نەبەز کە هەمیشە دەیەوێ خۆی بە دڵسۆزی زانست و کورد بە خەڵك بناسێنێ بۆ وتارێك داوای (٤٣٠) دینار دەکات . ئەم گرانجانییەش ئەو ڕاستییە ددخاتە ڕوو کەلای د. نەبەز پارە گرنگەنەك خزمەت .

سەرەڕای ئەو هەموو قین و دوژمنایەتییەی بەرانبەر کۆڕ نیشانی داوە ، هێشتا ئەو ڕووی هاتووە وا بە خەڵك ڕاگەیەنێ کە «کۆڕ لە (ڕووی پیاوەتی)یەوە خراپەکاری لە گەڵدا دەکات»(ل٩١) . لە پەراوێزی زمارە (٢٠) یشدا دەڵێ : « یەکێك لەو خراپەکارییانە ئەوە بوو کە کۆڕ لە کاتی خۆیدا تکای لێ کرم کە زۆر بە پەلە وتارێکی بۆ بنووسم لە بارەی (کوردناسییەوە لە ئەڵەمانیادا) . کە بە چەند ڕۆژێك بۆم نووسی و بۆم نارد ، ساڵێك دوای خست ئەوجا بڵاوی کردەوە . کە بڵاویشی کردوەوە هەموو وشە ئەڵمانییەکانی بە هەڵە لە چاپ دا » (ل١١٢) . پێشتر وەڵامی دوا بەندی ئەو مەبەستەی کە وتویە : « هەموو وشە ئەڵمانییەکانی بە هەڵە لە چاپدا» داوەتەوە ... ئێستاش هەندێ ڕوویتری ئەوکێشەیە ڕوون دەکەمەوە :

١ ـ د. نەبەز نەدەبوو ئەوە بکاتە گلەیی کە وتارەکەی دوای ساڵێك بڵاوکراوەتەوە ، چونکە کاتێ وتارەکەی ئەو گەیشتبوە کۆڕ ، بەرگی یەکەمی گۆڤاری کۆڕ کەوتبووە بازاڕەوە و وەك ئاشکراشە گۆڤارەکەش گۆڤارێکی دەورییە ، ساڵی یەك دوو ژمارەی لێ بڵاودەبێتەوە .

٢ ـ وەك ئاگادارم سکرتێری گشتیی ئەودەمەی کۆڕ ـ د. کەمال مەزهەر بە دڵ و بە گیان سەرپەرشتیی چاپی وتارەکەی دەکرد و زۆر بایەخی پێ دابوو ، بەڵکەش بۆ ئەمە ، ئەوەیە کە لە کوردییەکەیدا مەگەر بە دەگمەن هەڵەی چاپی تێ کەوتبێ . بەڵام ئەگەر لەو چەند پەراوێزە ئەڵمانییانەدا هەڵە ڕووی دابێ ، ئەوە بەر لە هەموو کەس گوناهی د. نەبەز خۆیەتی ، چونکە دەبوو بە تایپ یاخود خەتێکی باش بیان نووسێ ... وا دیارە د. نەبەز لە بیری چۆتەوە کە لە عێراق ڕادەی زانینی کرێکارانی چاپ ، بەتایبەتی چاپی کوردی چەندە . ئەگەر ئەوەی لە بیر نەکردایە ، وا ئەو ئەرکە زۆرە پڕ دڵسۆزییەی بە «خراپەکاری» لە قەڵەم نەدەدا و وشەکانی بۆنی بێوەفایییان لێ نەدەهات ... خۆ ئەگەر لە ڕووی هەڵەی چاپەوە بەراوردی ئەو وتارەی بکرێ کە کۆڕ بۆی چاپکردووە لەگەڵ ئەوەی لە گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیاتدا بۆی بڵاوکراوەتەوە ، ئەوە نەك هەر دەردەکەوێ کە ئەوەی کۆڕ زۆر پوختترە ، بەڵکو ڕادەی زانین و شارەزایی و دڵسۆزانی کۆڕیشی تێدا تیشك دەداتەوە . خۆ ئەوەی دەستەی بەڕێوەبەرانی گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات سەرپەرشتییان بۆ کردووە ، کە بە کوردییە نەك ئەڵمانی ، هێندە هەڵەی چاپی تێدایە ، کە بووەتە هۆی شێواندنی گەلێ شوێنی وتارەکە ... جا بڕوا ناکەم ئەوانیش بە نیازی خراپەکاری ئەوەیان کردبێ

٣ ـ د. نەبەز نامەیەکی لە گەڵ وتارەکەیدا ناردبوو داوای ئەوەی تیادا دەکرد کە پرۆڤەی وتارەکەی بۆ بنێرنە ئەڵەمانیا ، تاکو خۆی چاکی بکا . لەوە دەچێ د. نەبەز لە جیهانی خەیاڵدا بژی ، ئەگینا یەکێك لە ژیانیدا تاکە کتێبێکی چاپ کردبێ ، ئەوە دەزانێ کە نەك بۆ ئەڵەمانیا ناردن ، بەڵکو لە بەغداوە بۆ سلێمانیش ئاسان نییە . ئەگەر کۆڕ پرۆڤەی وتاری د. نەبەز بۆ ئەڵەمانیا و هی مامۆستا تۆفیق وەهبی بۆ ئینگلتەرە و هی د. قەناتی کوردۆ بۆ یەکێتیی سۆڤێت ... بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵە بنێرێ ئەوە بە چەند ساڵێك ژمارەیەکی گۆڤارەکەی بۆ چاپ ناکرێ ... لە سەرێکەوە د. نەبەز ئەو کارە گرانە لە کۆڕ داوا دەکات و لە سەرێکی دییەوە گلەیی دەکا کە وتاردکەی ساڵێك دواکەوتووە . ئەمە مەگەر د. نەبەز هەر خۆی تێی بگات .

ـ ماویەتی ـ

**پەراوێزەکان :**

(١٠) د. کوردستانی گیوی موکریانی ، نامەکانی کۆڕی زانیاری ملکەچن ، « ڕۆژنامەی هاوکاری » ، ژ٤١٥ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل٣ .

(١١) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، لێکسیکۆلۆژی زمانی کوردی ، بەشی یەکەم ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی دووەم ، بەشی دووەم ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل١٠١ .

(١٢) دیوانی نالی ، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی : مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(١٣) د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، وشەی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

(١٤) هەمان سەرچاوە ، ل ج .

(١٥) هەرچەندە دەزانم ، نەتەوە خۆشەویستەکەم لۆمەم ناکا کە ناچاری باسی دیاری‌یەکەمی پێ‌کردم ، بەڵام من خۆم هەر بە شەرمەزار دەزانم .

(١٦) د. جەمال نەبەز ، زمانی یەکگرتووی کوردی ، بامبێرگ ، ١٩٧٦ ، ل ٢٧ .

(١٧) لەم شوێنەشدا ، ئاشکرا دیارە کە چۆن د. نەبەز ((پیت) و (دەنگ)ی لە یەك جیانەکردۆنەوە .

(١٨) سەچاوەی ناوبراو ، زمانی یەکگرتووی کوردی ، ل ٢٧ .

(١٩) مەمێ ئالان : صالح عەلی گوللی و ئەنوەر قادر محەمەد لەڕێنووسی‌لاتینی‌یەوەهێناویانەتە سەر ڕێنووسی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٧ .

(٢٠) قەناتی کوردۆ ، کۆمەڵە تێکستی فۆلکلۆری کوردی . شوکور مستەفا و ئەنوەر قادر هێناویانەتە سەر ڕێنووسی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(٢١) عوسمان صەبری ، باهۆز و چەند ھێسارێن دن، شام ، ١٩٥٦ .

(٢٢) ئەحمەدی خانی ، مەم و زین ، ئەستەموول ١٩٦٧ . م. بۆزئەرسەلان لە چاپی داوە .

(٢٣) جگرخوین . سەورا ئازادی ، شام ، ١٩٥٤ .

(٢٤) دیوانا مەلایێ جزیری ، تویژاندنا صادق بەهائەدین ئامێدی ، بەغدا ، ١٩٧٧ .

(٢٥) ئۆسکارمان ، تحفەء مظفریە ، بەرلین ، ١٩٠٥ . هێمن موکریانی هێناویەتی‌یە سەر ڕێنووسی کوردی ، بەغدا ، بەشی یەکەم ، ١٩٧٤ ، بەشی دووەم ، ١٩٧٥ .

(٢٦) فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردەواری کۆکردنەوەی محەمەد کەریم شەریف ، کەرکوك ١٩٧٤ .

(٢٧) پەندی پێشینان ، کۆکردنەوەی شێخ محەمەدی خاڵ ، چاپی دووەم ، ١٩٧١ .

(٢٨) لەو نموونانەی سەرەوەدا باوەڕ پتر بۆ ئەوە دەچێ کە وشەکانی (دش، پشدەر، حەج) ناوی جینسی مێ بن ، چونکە وشەی (دش) لە هەموو ڕوویەکەوە بە جنسی مێ دادەنرێ . هەرچی وشەکانی (پشدەر) و (حەج) یشن لە دیالێکتەو بەشە دیالێکتەکانی تری کوردیدا وەك ناوی جینسی مێ بەکارهێنراون . بەڵام هەندێ پەندی پێشینانی ئەوتۆش بەرچاو دەکەون کە هەرچەند، نیشانەی (ێ)یان تیادا بەدی دەکرێ ، بەڵام سەرنج بۆ ئەوە دەچێ کە ئەو جۆرە پەندانە لە دیالێکتی ترەوە وەرگیرابن ، یاخود بۆ ڕێککەوتنی وەزن وا وترابێ ...

(٢٩) د. نەبەز بە هەڵە لەو شوێنە و لە تێکرای کتێبەکەیدا (نیشانە)کانی بە (ئامراز) ناوبردووە و ناو ناوەش بە (پاشگر)ی داناون . بێ‌گومان جیانەکردنەوەی ئەو جۆرە شتانە نیشانەی نەزانینی ئەلفوبێی زمانەوانی‌یە . بۆ وەرگرتنی زانیاری سەبارەت بە (نیشانە) و (پاشگر) و... (بڕوانە : د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٣٦ — ٤٠ .

(٣٠) بۆ وەرگرتنی زانیاری دەربارەی نیشانەی (ە)ی ناسیاوی (بڕوانە د. ئەورحمانی حاجی مارف، هەوڵێکی سەرەتایی بۆ دۆزینەوەی نیشانەکانی ناسیاوی و نەناسیاوی لە دیالێکتی کرمانجی خواروودا . « گۆڤاری زانکۆ » ، ب ٣ ژ ٢٢ سلێمانی ١٩٧٧ ، ل ١٤٦ — ١٤٨ .

(٣١) تەوفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی . جیزمی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٢٩ ، ل٣٢—٣٨ .

(٣٢) گۆران ، بەهەشت و یادگار و فرمێسك و هونەر لەگەڵ دوو هاوینە گەشت ، سلێمانی ، ١٩٧١ .

(٣٣) لەبەر ئەوەی لە وشەی (سەگ‌گەل)دا دوو دەنگی (گ)ـوانە دوو دەنگی کۆنسۆنانتی وێکچوو کەوتوونەتە پاڵ یەك، لە دەربڕیندا کورتکردنەو ڕوو دەدات واتە (گ)یەك قووت دەدرێ و (سەگەل) دەوترێ .

(٣٤) پیرەمێردی نەمر . محەمەد ڕەسووڵ هاوار ، بەغدا ، ١٩٧٠ .

(٣٥) بڕوانە : چەرکەزی بەکۆ (باکایێف) ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل٩٤—٩٨

(٣٦) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، هەوڵێکی سەرەتایی ... ل ١٤٩ — ١٥٥ .

حمید عزیز کردوویە بە کوردی

# تێکستە فە
# میلیسوس

میلیسوس سەر بە قوتابخانەی ئیلیایە ، قوتابی بارمەنیـدس(١) بوود ، کتێبێکی داناوە بەناوی « دەربارەی سروشت یاخود دەربارەی بوون » تێیدا داکۆکی لە فەلسەفەی مامۆستاکەی(٢) ئەکاتو هەوڵئەدات ساخیبکاتەوە کە بوون یەك شتەو بزوتنەوە نییەو بۆشاییو گۆڕان واهیمەنو هەر شتێك سەرەتاو کۆتایی نەبێت ئەبەدی ئەبێ .. دە برگە لەو کتێبەی ماوەتەوەو ئەوانیتر فەوتاون ... ئەمەش ئەو بەشەیە کە مێژوو پاراستویەتی :

**« دەربارەی سروشت ...(٣) »**

(١ـا) ئەگەر نابوون هەبێ ، وەك شتێکی راستەقینە ئەکرێ چی لەبارەیەوە بوترێ ! .

(١) ئەوی هەبوویە لە ئەزەلەوە هەبووەو هەتا هەتایە هەر هەبوو دەبێ ، چونکە ئەگەر ئەو پەیدابوو بێ، ئەبێ هیچ شتێك لەپێش پەیدابوونیدا نەبووبێ . وە ئەگەر ئەو هیچ نەبووبێ ، ئەوا بەهیچ رێگایەك لە هیچەوە پەیدا نابێ .

(٢) لەبەر ئەوەی بوون پەیدانەبووە ، بگرە ئەو هەبوویەو هەمیشەییە، ئەزەلییە، ئەوا سەرەتاو کۆتایی نییەو بێسنورە ، چونکە ئەگەر نەبووبایەو پەیدابووبایە ئەوا سەرەتاو کۆتایی ئەبوو . بەڵام ئەگەر ئەو سەرەتاو کۆتایی نەبێو لەئەزەلەوە هەبووبێو هەتاهەتایە بمێنێ، ئەوا نە سەرەتای هەیەو نەکۆتایی ، کەوابوو مەحاڵە هیچ شتێك هەبوو بێ ئەگەر بوونە هەمەکییەکە هەبوو نەبێ .

(٣) سەرڕای ئەمە ، هەروەك ئەو هەمیشەییە ، ئەبێ هەمیشە لە مەزنیدا بێسنور بێ .

(٤) بەڵام هەر شتێك سەرەتا یان کۆتایی هەبێ ، نە ئەبەدی یان نە بێسنورە .

(٥) ئەگەر ئەو یەك نەبووبایە بەشتێکی تر دەور ئەدرا [ سنوری بۆ ئەکێشرا ] .

(٦) چونکە ئەگەر ئەو (بێکۆتایی) بێ ، ئەبێ یەك بێ ، ئەگەر دوو بووایە بێکۆتایی ئەدەبوو ، چونکە ئەو کاتە یەکێکیان دەوری ئەوی تریانی دەدا [ سنوری بۆ دەکێشا ] .

(٦ـا) [ مادام ئەو یەکە ، لەهەر کوێیەك بێ وەكیەکە ، چونکە ئەگەر ئەو وەكیەك نەببایە ئەبوو زۆر بێو یەك نەبێ ] .

(٧) بۆیە بوون ئەبەدی ، بێسنورو یەکو هەموو وەكیەکە، ناکرێ لەناوبچێ یان مەزنتر ببێو هەست بە ئازار بکات یان خەمباز ببێ ، چونکە ئەگەر هەر یەکێك لەم شتانەی بەسەرهاتبایە یەك ئەدەبوو ، وە ئەگەر ئەو بگۆڕێ ئەوا ناکرێ راستەقینەکە هەموویەکی وەكیەك alike بێو بگرە ئەوی لەمەوبەر هەبوو بووە لەناودەچێو ئەوی نەبوو بووە پەیدا دەبێ ، ئێستاش ئەگەر بوون بە ئەندازەی تاڵە موویەك لە دە هەزار ساڵدا بگۆڕێ هەموو بوون لەسەرجەمی کاتدا لەناودەچێ ، هەروەها ناتوانرێ رێکوپێکییەکەی Urder بگۆڕدرێ ، چونکە ئەو رێکوپێکییەی لەمەوبەر هەیبووە لەناوناچێو رێکوپێکییەکی نوێ پەیدا نابێ . وە لەبەر ئەوەی هیچ شتێك ناخرێتە سەربوون یان هیچی لێ نافەوتێ یان ناگۆڕێ ، ئەوا چۆن رێکوپێکی شتی راستەقینە دەگۆڕدرێ ! چونکە ئەگەر شتێك گۆڕانی بەسەرداهات ئەوا ئەمە وەك گۆڕانە لە رێکوپێکییەکەیدا Its order .

هەروەها بوون ئازار ناچێژێ ، چونکە شتێك ئەگەر ئازاری چەشت هەبوو نابێو چونکە شت کە ئازاری چەشت ئەبەدی نابێو ئەو هێزەی نابێ کە لە هەبووی هەمەکیدا هەیە . وە ئەگەر لەئازاردا بێ وەكیەك نابێ alike ، چونکە ئەو تەنیا بەوەی شتێکی بخرێتەسەر یان لێی بسێنرێ Subtraction هەست بە ئازار ئەکاتو ئەو کاتە ئیتر وەكیەك نابێ ، هەروەها ئەگەر ئەو هەمەکی بوو هەست بەئازار ناکات ، چونکە ئەوکاتە ئەوەی هەموودو ئەوەی راستەقینەیە لەناودەچێو ئەوی نەبووە پەیدادەبێ . ئەم بەڵگەیە خۆی خەم ئەگرێتەوە هەروەك ئازاریش ئەگرێتەوە . هیچ شتێك بۆشایی نییە . چونکە بۆشایی هیچە Nothing .

# سەفەیەکەی
# ساموٚسی

ناکرێ ئەوەی هیچە هەبوو بێ . بوون ناجوڵێتەوە ، چونکە هیچ جێگایەکی نی‌یە رووی تێبکات ، بکرە ئەو پڕە Full چونکە ئەگەر بۆشایی هەبووایە ئەوا ئەو رووی لە بۆشاییەکە ئەکرد ، لەبەرئەوەی بۆشایی نی‌یە بۆ هیچ جێگایەك مل‌پێوەنانێ .

هەروەها ناکرێ بوون خەست dense و تراو بێ چونکە مەحاڵە وەك ئەوی خەستە پڕ بێ ، بکرە تراو rare لە خەست کەمتر پڕە .

ئەمە ئەو رێگایەیەکە ئەبێ ئێمە ئەوی پڕە پێ‌ی لەوی ناپڕە جیابکەینەوە . ئەگەر شتێك جێگای هەبوو بۆ شتێکی تر و گرتیەخۆی ، ئەوا خۆی پڕنابێ . بەڵام ئەگەر جێگای نەبێ بۆ شتێکی تر و نەیگرێتە خۆی ئەوا خۆی پڕە .

کەوابوو دەبێ بوون پڕ بێ مادام بۆشایی نی‌یە ، ئەگەر بوون پڕیی بێ ئەوا ناشجوڵێتەوە .

(٨) کەوابوو ئەم بەڵگەیە argument گەورەترین بورهانە لەسەر ئەوەی کە بوون تەنیا یەکە، هەروەها ئەوانەی خوارەوەش چەند بورهانێکی ترن : ئەگەر زۆر هەبووایە دەبوو زۆرەکە لە رەگەزی یەکەکە بووایە . چونکە ئەگەر زەوی‌و ئاوو هەواو ئاسن‌و ئالتون‌و ئاگر هەموویان‌و هەندێ شت زیندوو هەندێکی تر مردوویان‌و ئەگەر شتەکان رەش‌و سپی‌یان‌و ئەوانەی خەڵك ئەڵێن راستەقینەن وابوونایە ، ئێمە بەراستی بمانبینیایەو بمانبیستبایە ، ئەوا ئەبێ هەر یەکێك لەمانە بەو شێوەیە بێ کە یەکەم جار بڕیارمان لەسەرداو ناکرێ بگۆڕێن یان جیاواز بن ، بکرە هەریەکێك چۆن بووە وەك خۆی بێ ، بەڵام هەروەك خۆی وەهایە ، ئێمە دەڵێین بەراستی دەبینین‌و دەبیستین‌و تێدەگەین‌و ئێستا لەو باوەڕەداین کە ئەوی گەرمە سارد دەبێت‌و ئەوی ساردە گەرم دەبێ‌و رەق نەرم‌دەبێ‌و نەرم رەق دەبێ‌و ئەوی زیندوە دەمرێ‌و ئەو شتانە لەوی مردووە لەدایك دەبن‌و ئەم شتانە هەموویان دەگۆڕێن‌و ئەوی جاران هەبوو و ئێستا هەیە بەهیچ رێگایەك وەك یەك نین ، ئێمە لەوباوەڕەداین ئاسن کە رەقە ، بەدەست‌پێداهێنان لوس ئەبێ‌و هەروەها زێڕو هەموو ئەوانەی کە بەرەقیان دادەنێین، هەروەها کە زەوی‌و بەرد هەردووکیان لەئاو دروستکراون ، لەمەوە وا دەرئەکەوێ کە ئێمە راستی نە بەچاو دەبینین‌و نە دەیناسین . ئەم شتانە [بەڵگانە] لەگەڵ یەکتری‌دا گونجاو نین ، ئێمە وتمان زۆر شت هەیە کە ئەبەدین‌و چەند وێنەو هێزێکی تایبەتی خۆیان هەیە لەگەڵ ئەمەش‌دا وامان بۆ دەرئەکەوێ کە هەموویان دووچاری دەستی گۆڕانن‌و لەهەر کاتێك‌دا وا نامێنن کە بینیومانە،کەوابوو رونە ئێمە نە بەراستی بینیومانەو نە لەوەشدا راست‌بووین کە باوەڕمان وابووە کە ئەم هەموو شتانە زۆرن . چونکە ئەگەر ئەمانە راستەقینە بوونایە نە ئەگۆڕان ، هەموو شتێك هەروایە کە بۆمان دەرئەکەوێ ، چونکە هیچ شتێك لەوی راستەقینەیە بەهێزتر نی‌یە . بەڵام ئەگەر بوون گۆڕا ئەوا ئەوی هەبووە لەناودەچێ‌و ئەوی نەبوو بوە پەیدادەبێ . بەبێ ئەمە ئەگەر زۆر شت هەبووبێ ، ئەبێ لەهەمان سروشتی یەکەکە بن .

(٩) ئێستاش ئەگەر بوون هەبوو بێ ، ئەبێ یەك بێ ، ئەگەر یەك بوو ناکرێ لەشی هەبێ ، چونکە ئەگەر هەی‌بووبایە ئەبوو پارچەی هەبێ ئیتر یەك نەدەبوو .

(١٠) ئەگەر ئەوی راستەقینەیە دابەش ببێ divided ، ئەوا ئەشجوڵێتەوە ، بەڵام ئەگەر بجوڵێتەوە هەبوو نابێ .

## ● پەراوێز ●

(١) جۆن بێرنت لە کتێبی (ئێرلی گریك فیلۆسۆفی‌دا) چاپی چوارەم ، لەندەن ١٩٥٨ لاپەڕە ٣٢١ ـ ٣٢٤ ئەم دە بڕگەیەی بە ئینگلیزی بڵاوکردۆتەوە .

(٢) میلیسوس ٤٤٤ ساڵ بەر لە زایین لەدایك‌بووە.

# وليام شێكسپير

# ئەو جۆرەی بتەوێ

## As you like it

هێمن کردوویە بە کوردی

ڕۆژگارێـك بوو ، وڵاتی جوان و دلگرو گانكائـەوین و دلـداری فەرانسە ، بەرەڵلاو هەر کـەس هەرکەس بوو ، کەس سەری بـۆ کەس دانەدەنواند ، کەس بە ڕبەی کەسی نەدەپیوا ، و هەر لایـەی بەدەس میرو مەزن و دەرەبەگێکـەوە بوو .



له ناوچەیەکی لەم وڵاتە میرێکی زۆرداری ، داگیرکـەری بێبەزەیی فەرمانڕەوای دەکرد . کە تەختـی میرایەتی له دەس براکەی خـۆی دەرێنا بوو و موڵك و ماڵی لێ بڕی بوو . ئەو میرە لەدەس پیسـی و ناپاکی و ماڵپەرستی‌دا وێنەو هاوتای نەبوو . براکەی خۆی کە تا رادەیەك لەنێو خەڵك‌دا ناخۆشەویست نەبوو دەرکـرد بوو برای زۆر لێکـراوو وەدەربراو پـەنای بۆ لێـڕەواری چڕوپڕو دوورەدەستی « ئاردن » برد بوو . لەوێ لەگەڵ چەنـد دۆست و ئاشناو لایەنگری خـۆی ژیـانێکـی خـۆش و ئـازادو بێدەردی‌سەری دەبردە سەر .

ورده ورده ئۆگری ژیانی ساکاری جەنگەڵ بوو . خـەم و پەژارەی بەدیتنی دیمەنە جوانەکانی خۆرسك دەڕوانـد ، ئاوی سـاردو روون و بێخەوشی کانیاوی دەخواردەوە . هەوای خاوێن و سازگاری زەنوێرانی هەڵدەمشـت . کارگ و رێواس و شیرو ماست و پەنیرو لۆرك و کەرەو هەنگوێنی لێری لە چێشتە چەورو سوێرو تیژەکانی کۆشك باشـتر بێدەکـەوت و دەردو دمغـەزی دەپەڕانـدو ئازارو نەخۆشـی نەدەهێشت .

ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەی لێ قەو ماوو ڕاونراوو دەرکراوەکان پتردبوون و دەورەی قـەوغاتر دەبوو ، وەرەزی زیاتر ددشکاو مەترسی کەمتر دەما .

ئەو میرەدەرکراوە کیژێکی هەبوو ، کە ئاحەز بکەی نازدارو لەبارو وریاو وشیار بوو . ئەوەندە گفت‌خۆش و خوێن شـیرین و ڕەزاسووك بوو ، کەس نەبوو بەدڵ خۆشی نەوێ . « ڕۆزالیند » لەو ڕۆژەوە باوکی بۆ پاراستنی گیانی خۆی پەنای بـۆ (ئاردن) بردبوو لـە ماڵـە مامـە زۆردارەکەی‌دا مابۆوە. تا هاودەنگ و هاودەمی «سلیا»ی کچی مامی بێ . ئەو گلدانەوەیە هەرچەند ڕۆژەکانی هەموڵ سەخت و تاڵ و ناخۆش بوو . بەڵام کەم کەم ئۆگری یەکتری‌بوون و وەك دوو دۆستی پاك و چاك بوونـە یاری گیانی گیانی .

چیرۆکی ئێمـە لە کاتێکـەوە دەس‌پێ‌دەکا کە « ڕۆزالیند » وەك هەموو ڕۆێ لـە بەر پەنچـەرەی ژووری «سلیا» دانیشتبوو و دەستی وەبەرچەنەی هەڵدابوو و بیری لـە ژیانی پچڕاوو هەڵودشاوی خێزانی خۆیان دەکـردەوەو «سـلیا» ش دەستی دۆستانەو دلسوزانەی بـە پرچە نەرم و جوانەکانی دادەهێنا .

لەو کاتەدا خزمەتکارێکی ئەمـیر هاتەژوورو پەیامی ئەمیری بۆ هێنان گوتی : « ئێستا ئەمیر دوو پاڵەوانان بەگژ یەکدا دەکا وەدەفەرمێ ئەگـەر پێیان خۆشە ئەوانیش بێنـە تەماشا .

لەو سەردەمەدا ئەوە باو بوو کە پاڵەوانان لە پێش‌چاوی میرو گەورە گەوران زۆرانبازی بکەن و ئەوانیش لە سەیرێ ڕاوەستن و ئـەو کارە دزێوو ناشیرین و ناپیاوانە مـایەی

سەرگەرمی‌و دلخۆشی رەسەن رادەکان بوو « رۆزالیند»و «سلیا» ش کە زۆر وەرەزو دلتەنگ بوون ۆ تەماشا چوون . بەلام بەداخەوە دیمەنەکە لەباتی ئەوەی شادیان بکا ، پتری وەرەزو پەریشان‌کردن. چونکە تەماشایان کرد . لاوێکی مێرمندال‌و شروش‌و باریك‌و لەبار ئامادەیە لەگەل لەندەهۆرێکی مل ئەستوورو دێوەزمەیەکی بێ‌شاخ‌و کلك‌و سینگ‌پان‌و بەشان‌و باهۆ ئامبازی بەك‌بن جیاوازی تەمەن ، یەك نەبوون ئەش‌و ئەندام‌و نیشانەی هێزو ئەزموون ئەوەندە دیارو بەرچاو بوو . هەموو کەس دەیتوانی بەرهەمی ئەم بەگژیەکداچوون‌و نامبەرابەرە خەفەتبارە بەئاسانی پێش‌بینی بکا . کەچی لاوەکە بزەی لەسەر لێوان ڕوو ، هیچ ترس‌و نیشانەی وبەزینی تیدا بەدی‌نەدەکرا . ددتگوت : بەتەواوی دلنیایە زال دەبێ. «رۆزالیند» زۆر بەشێو خەمبار بوو . وردە وردە نە لاوەکە چۆ پێش . نیگای سیحراوی‌و دلرفێنی تێبری‌و بەزمانێکی نەرم‌و شیرین پێی گوت : «دەس لەم کارە مندالانەو شێتانە هەلگرە . چونکە ئەم کابرا زل‌و زەبەلاح‌و کارامەیە لەوانەیە ژیان‌و لاوەتی تۆ بخاتە مەترسی‌یەوە . لاوە نەناسەکە بە ئەدەبەوە گوتی : « داخی گرانم ناتوانم ئامۆژگاری ئەم کیژە نازدارە لەگوێ بگرم . » من لەمو بەرەنگاربوونەدا بڕیاری خۆم داوە . و لە حالێکدا کە بەتاسەوە چاوی لە چاوی کیژەکە بڕی‌بوو درێژەی دایە « ئەگەر زال‌بووم شانازی‌یەو ئەگەر تێداچووم لە کاری خۆم پەژیوان نیم چونکە لەم جیهانە پان‌و پۆرەدا تاقە کەسێك نیە دەنکە فرمێسکێکم بۆ بڕێژێ تەنیا ئاواتم ئەمەیە لەم ملانەدا دلسۆزی‌و خەمخۆری تۆ پشتیوانم بێ » .

زۆرەوانی دەس‌پێکرا «سلیا» بە ئاواتنەوە بوو لاوی بێگانە سەرکەوێ . «روزالیند» دەپاڕاودو لە خودای دەویست لاوەکە بپارێزێ. حالی ناهومیدی بەتایبەتی ترسی مەرگی لاوەکە پەریشان‌و هەراسانی کردبوو . هەستی کردبوو، ئەم لاوەش وەك ئەوبێکەس‌و بێ پەنایەو بۆتە نیشانەی تیری ئەو رۆژگارە زۆردارە . دلەکوتەی گرتبوو . بۆ یەکەم‌جار شتێکی لە دلی خۆی‌دا هەست کردبوو . ئەویش هەستی خۆشەویستی‌و ئەوین بوو .

بە پێچەوانەی بۆچوونی تەماشاکەران لاوی مێرمندال کە لەبەر کابرای بەگەدو گیپال ڕاچوو توند مەچەکەی لێ ئەنگاوت‌و چەند باوی توندی دایەو لێ‌ئال‌و تێکیەوە پێچاوەو پرزەی لێ‌بڕی . جا بە هەر دوو دەست بەرزی کردەوەو وای بەرق بە هەردی دادا کە لەجێی خۆی ئەبزووت‌و چوار پەلی هاویشت . دەنگی ئافەریم ، هوریاکیشان‌و چەپلەرێزان لە هەموو لایەکەوە بەرزبۆوە . میر سەری سوڕماو خۆی پێ رانەگیراو لاوەکەی بانگ‌کردو لەبنەچەکەو رەسەنی پرسی :

**« وەلامی دایەوە کوڕی کچکەی (سێر رولاند بز ) م » ئەمیر گرژو مۆن بوو و رووی لێوەرگێرا. باوکی دەناسی‌و دەیزانی یەکێك لە دۆستانی نیزیکی براکەی بوو .**

بەلام «روزالیند» گەلێك پتری خۆش‌ویست لەحالێکدا کە دەستی «سلیا»ی دەگوشی گوتی : باوکم باوکی ئەم لاوەی زۆر خۆش‌دەویست‌و متمانەی تەواوی پێ هەبوو . ئەگەر دەمزانی رۆلەی کێ‌یە ؟ بەهیچ بارێك نەمدەهێشت توخونی ئەم غوولە بکەوێ‌و خۆی لەمەترسی باوێ . بە هەناسەو فرمێسك داوێنم دەگرت‌و وازم پێ دەهێنا .

هەردووك چوونە لای کوڕەکە کە لەبێ مەیلی میر دلی یەشابوو . زۆریان لاواندەوەو دلخۆشی‌یان دایەوە . کە هاتن بڕۆن «رۆزالیند» زنجیرێکی لە ئەستۆی مەڕمەڕینی دەرهێناو لەمستی ناو گوتی : « **ئەم یادگارە بچووکەم لێوەرگرە من لە مالی دنیا چیدی شك نابەم . دەنا ئەتۆ بۆیە دەبووی دیاری زۆر بەنرخترت بدەمێ** » .

— ٢ —

فرمدریك فەرمانڕەوای داگیرکەر کە وەفای (روزالیند)ی لەگەل لاوەکەی بینی‌و لە لای ذیکەشەوە باسی پاکی‌و چاکی‌و نازداری‌و بێ‌ئازاری ئەویان پێ‌راگەیاند بوو بەرق داچووو هاتە سەر ئەوەی برازاکەی لە مالی خۆی دەرکا . رۆژێ لەگەل «سلیا» لێی وەژوور کەوت . و بێ‌شەرمانە پێی گوت دەبێ لێرە بڕۆی . هەرچی «سلیا» پاڕاوەو گریاو دەست‌و داوێنی باوکی بوو . سوودی نەبوو . ناچار تکای لە باوکی کرد لێ‌گەڕێ ئەمشەویش پێکەوە رابوێرن .

شەوێ تەگبیریان کردو هاتنە سەر ئەوەی بەجووت رابکەن‌و خۆیان بشارنەوە . بەیانی زوو یەك لەجلکی لاوێکی ترنلو ئەوی دیکە لە بەرگی کچێکی لادێ‌دا بەدەرکی

نەهینی کۆشکدا دەرباز بوونو بە ناشارەزایی روویان لە جەنگەلی «ئاردن» کرد .

هیچ کام نەیاندەزانی چیان بەسەر دێ‌و رۆگار چ بۆسەیەکی بۆ ناونەوە. رێباز نادیارو دوا رۆژ ونبوو . تەنیا ئامانجیان ئەوە بوو . ریگای درێژ ببرنو زووبگەننە لیرەواری «ئاردن» بەلکە میر لەوێنەدرێ بدۆزنەوەو ژیانی تاریكو تنووكو ساردو سڕیان لەبەر تیشکی سەرپەرستیو لاواندنەوەی ئەودا رووناكو گەرم بێتەوە روزالیند لەجلکی لاوێکی توندو تولو «سلیا» لەبەرگی کیژێکی لادێیدا زۆر ئاسایی دەهاتنە بەرچاو . بەنێو سەدان رێبواردا تێپەرینو کەسی نەیناسین . کاتێ رۆژئاوا بوو لە یەکەم قوناخدا باش حەسانەوە . چونکە خشلو دراوی زۆریان پێبوو توانیان ژووری چاك بگرنو خۆراکی باش بخۆن .

— ٣ —

«ئورلاندو» گچکەترینو لاوترین کوڕی «سێررولاند» بوو هەر لە سەرەتای ژیانەوە رۆژگار ژەهری ناکامی لە جامی کردبوو ، هێشتا زارۆکێکی پچووك بوو کە باوکی بۆهەمیشە بەجێی‌هێشتبوو و چارەنووسی دابوو بە دەستی برا گەوردکەی « ئلیور » لاوێکی سووكو خۆش رابوێرو لەخۆبایی بوو. بەپێچەوانەی وەسیەتی باوکی کە کوڕە چووکەکەی پێ‌ئەسپارد بوو . هیچ ئاگای لە براکەی نەبووو باشی پێ‌نەگەیاند. «ئورلاندو» لەگەل ئاوالی گەڕۆكو سووکەلەو هیچو پووچ گەورە بوو . بەلام چونکە بۆخۆی چاكو دلپاك بوو بەخوێریو دەستەوەستان .دەزنەچووو باش پێ‌گەیشت لاوێکی ئاکار باشو بوێرو بەهێزی لێ‌پەیدابوو . ئەوە هەستی ئێرەیی‌و بێزاری کاکی بزواندو خەریك بوو بەجۆریك سەری لە ناخێ رۆکاو لەنێوی بەرێ .

بەو مەبەستە شوومە هانی دەدا بەرەنگاری پالەوانی بە ناوبانگو کارامەی‌بکا . بەلکە بەدەس ئەوان بچێ . بەلام بەختەوەرانە هەموو جارێ زالدەبوو ئەوانی دەشکاندو دەبەزاند . کە لەو کارە ناهومید بوو رۆژی ژووری نووستنی ئاگر تی‌بەردا کە بە هەزار حال رزگاری هات .

— ئادام — کۆنە خزمەتکاری باوکی کەبەشی زۆری تەمەنی لەخزمەتی ئەونەمالەدا بردبۆە سەر لەورازەی گەیاندو واداری کرد پێش ئەوەی نەخشەی ناپاکی کاکی جێ‌بگرێ رابکاو ولات بەجێ‌بێلێ‌و چونکە دەیزانی هیچ دراوی نیە . پاشەکەوتی خۆی دایەو بۆخۆشی لەگەلی کەوت .

کە گەیشتنە جەنگەلی «ئاردن» پیرە پیاوی زورهان لەپێ‌کەوت . (ئورلاندو) ئەوی لەبن سێبەری دارێك داناو بۆخۆی بۆ پەیداکردنی خواردەمەنی بەباریکە رێ‌یەکدا کە جەنگەل دەرۆیشت رۆیی. تاتووشی جێگایەك بوو کەمیرو دۆستانی خەریکی خواردن بوون . شری لەکالان دەرکێشا کە بەزۆری خواردنیان لێ‌بستێنێ . بەلام میر فەرمووی‌داو بەرووخۆشی گوتی وەرە نان‌بخۆ . «ئورلاندو» لەکاری خۆی پەژیوانو شەرمەزار بۆوەو داوای لێ‌بووردنی کردو سەرگوزشتەی خۆی گێراوەو گوتی: ناوی «ئورلاندو»ە و کوڕە چووکەی «سیررورلاند»ە. ئەمیر کە بیردوەری زۆر خۆشی لە دۆستایەتی باوکی بوو لە ناسینی ئەو زۆر شادبوو دەس بەجێ ناردی پیرە پیاوەکەشیان هێنا زۆر بەخێرهاتنی کردنو لەژێر بالی‌خوێ کرتن .

— ٤ —

هێشتا حەوتویك بەسەر ژیانی (روزالیند)و «سلیا» لە جەنگەلدا رانەبردبوو .رۆژێك (روزالیند) بەبن پیرە دارێکدا تێ‌پەڕی تەماشای‌کرد ناوی ئەو لە بەژنی دارەکە هەلکەندراوە بەلایەوە سەیر بوو . هەروا دەگەڕا دیسان دیتی ناوی بە دارێکی دیکەوەیە . هەرچی سەری هێناوبرد بۆی ساخ‌نەبۆوە ئەوە چی‌یە ؟ ئاخری هاتە سەر ئەوە دەبێ لەو لێرەدا فریشتەیەکی ئەفسانەیی هەبێ کە هاوناوی ئەو بێ . لەو خەیالەدا بوو کوتوپڕ تووشی لاوێك بوو کە خەریکی راوبوو کە باشی تێ‌راما «ئورلاندو»ی ناسی‌یەوە . دلی کەوتە لێدانو رەنگی بزڕکا ، لێی‌نیزیك‌بۆوەو گوتی: **ناوت‌چی‌یە؟** گوتی : «ئورلاندو» ئەویش ئەوینێکی شورتو گومو ئاواتێکی بابردەلەی لەروخساری ئەودا بەدی‌کردو ناوی پرسی : گوتی : «کاینمد»ە پێکەوەگەڕان «ئورلاندو» بۆی‌گێراوە کە چۆن جارێك لەو پەڕی ناهومیدی‌داو لەکاتی ملانەدا کچێکی جوانچاكو دلپاك هومیدی وەبەرناوەو شێتو شەیداو گیرۆدەی خۆی‌کردوە . لەو دەمیەوە لەبیری نەچۆتەوەو هەمیشە گۆرانی پرسۆزی پێ‌هەلدەلیو ناوی لە داری جەنگەل هەلدەکەنێ . «روزالیند» وەختابوو لە هۆش‌بچێ‌و

خۆی لە ئامێزێ باوێ .

بەڵام خودای ئەقل تێی راخوڕی جارێ وەختی خۆناساندن نیە . چاکە تاقیبکەوەو بزانی رادەی وەفاداریو فیداکاری چەندە ! گوتی : من «روزالیند» دەناسمو خزمایەتیم لەگەڵی هەیە واچاکە من لەجێگای ئەو دابنێو هەرچی لە دڵتدا هەیە بۆم هەڵڕێژی تاهەمووی پێرابگەیەنم .

«ئورلاندو» هەموو رۆژی دەچوە کن دۆستە تازەکەیو دەچووە نێو دارو دەودنو گوڵو گوڵزارو کانیو جۆبارو خەمی دڵی خۆیان دەرەواند .

بەردبەیانێك تازە گزنگ گەوتبوو کە «ئورلاندو» هەستاو بەرەو دیداری دۆستەکە رۆیشت . تەماشای کرد کابرایەك لە سەر چەقی رێگا راکشاوەو خرپ خەوی لێکەوتوە تێی فکریو بیرا گەورەکەی خۆی «ئلیور»ی ناسیەوە پێ سەیربوو ئەو فێابازو ترسنۆکە لێرە دەبینێ ؟ ئەو زۆر لەوە پیاوترو ئازاتر بوو تۆڵە لە دوژمنی بێدەستەڵاتو خەوالوو بستێنێتەوە . بەڵام بە بێزاری لێی لاداو رووی وەرگێڕاو خەریك بوو تێپەڕیو بڕوا تەماشایکرد مارێکی شینی گانەیکنۆ ملی قەف کردوەو گەزارەی دەرکێشاوەو بەرەو ئەو رەخوشێ هەستی ئینسانیوخوێنی برایەتی هەموو رقو قینی کۆنی لەبیر بردەوەو شیری هەڵکیشاو رایکردە مارلەپڕ نەڕەی دێلە شێرێك جەنگەڵی لەرزاندوە ئەو نەحەبەسا لەپێشدا ماری دوولەت کرد و پاشان بەگژ شێردا هات شەڕێکی خۆێناوی رووی‌دا شێری تووڕە پەلاماری دایەو ئەویش دابنەنواند وەبەر شیرانیداو شپرزەی کردو شێری تووڕەو بریندار ئامبازی بووو بەچەنگالی تیژی لایەکی شانیتاپەنجەیدادڕی. بەڵام نووکی شیری ئەویش جەرگو ریخۆڵەی وەدەشتی خستو خستیو حەیاتی رەشی لێبڕی .

«ئلیور» کە ئەو دیمەنەی دی فرمێسکی پەشیمانی بەچاویدا هاتەخوارو ئەوەندە بەخۆی داشکاوەو شەرمەزار بۆوە . کە خوێ بەسەر پێی براکەی داخستو داوای کوشتن یا بوردنی لێکرد «ئورلاندو» کە دڵێکی پاكو بیرێکی رووناکی بوو . لە باوەشی خوێ گرتو هیچی کۆنی لەبیر نەماو بەخشی . بەڵام حوێزێژی باسكو ماندوویی لەشی بڕستی لێبڕیبوو . نیشانە مەنزلی کچەکانی پێگرتو ئلیوریش لەکۆڵی کردو بردیەوە ماڵی روزالیند و کارد ساتەکەی بەتەواوی گێڕاوە . سلیاو ئلیور خەریکی برژاندنەوەی برینەکانی باسکیو حەساندنەوەی گفتوگۆی لەشی برون . «ئورلاندو» شەرمەزار بوو کە ئەوەندە شەکەتە . بەڵام «سلیا» بەپێکەنینەوە دەیگوت : پێت وایە لەگەڵ بێچود پشیلە گەمەتکردوە . تۆ دێلەشیری سەر توتکانت کوشتوە. لەو حاڵەدا «ئلیور» چاوی لەچاوە جوانەکانی «سلیا» نەدەترووکاند. دیار بوو سلیاش بێ مەیل نەبوو جار جار بەناز پەنجەی ئلیوری دەگوشیو وەڵامی داو خۆزیەکانی دەداوە .

«روزالیند» پاش تاوێکی گوتی . «ئورلاندو» بێنە لای من باشترم ئاگالێ دبێ . بەڵام باسی پەریشانی منی بۆ مەکە . ئلیور کەدڵو دینی لە پێناوی ئەوینی ئەو کیژە نەشمیلە نابوو . بەپەلەهاتەوەلای ئورلاندو ئەوی لەرازی خوێ ئاگادار کرد . وگوتی لە خودای دەوێ کە سلیا ببیتە ژنی ئەو ئورلاندو بەزەیەکی هاتە سەر لێوانو گوتی بچۆ لای وهەموو قسەی خۆتی بۆ بگێرەوە . نابینی ئێستا تەنیایەو گاینمد دێتە لای من . دوو دڵدار کە بەرواڵەت دوو دۆستی گیانی بوون بە تەنێ مانەوە ئورلاندو باسی ئەوینی (ئلیور)و سلیای بۆ گێڕاوە . پاشان گوتی خۆزگەو هەزار خۆزگە ئێستا روزالیندی خۆشەویستی منیش لێرە دەبوو . رۆزالیند گوتی خەمناك مەبە سبێنێ جوانترین بەرگی خۆت لەبەر بکە وەرە بنکەی میر ناردوومە خۆشەویستە کەتبێ تکای لێدەکەم بێتەرەداو شووت پێبکا بەیانی میوانیەکی باش لە بنکەی میر رازاوە . نورلاندو ، میر ، ئلیورو ئەوانی دیکە- چاودێر بوون لە پڕ دوو کچی جوان بەجلی خۆ ولاتی دەرکەوتن روزالیند خوێ بەسەر پێلاوی باوکی داداو تکایلیکرد ئیزن بدا مێرد بە (نورلاندو) بکا . میر لەخۆشی دیداری کچەکەی وەختابوو باڵبگرێ و دەستی دوو نۆبووکانی لە دەستی دوو تازە زاوا نا .

لەو لاشەوە میر داگیرکەر کە تەنانەت کچەکەی خۆشی لە دەستانی رایکرد بوو. بەری شەپۆلی تووڕەیی خەڵکی نەگرتو پەنای بۆ دێربرد . میری پێشوو سەر لەنوێ چۆوە سەرتەختی خۆی .

**خەستەخانە ١٠-١١-١٩٧٨**

**هێمن**

چیرۆکێکی شانۆگەریە

# پیاچوونەوە

عبدالله سەراج

**کەسانی چیرۆکەکە**

١ ــ نوسەر : تەمەنی ٤٠ ــ ٤٢ ساڵە ، چاویلکە لە چاو دەکات .

٢ ــ ئافتاو : تەمەنی ٢٠ ــ ٢٥ ساڵە، کراسێکی ئاودامانی لەبەرە .

٣ ــ بارام : مرادخانییەکی شـری دوو ڕەنگی لەبەرە .

٤ ــ شوان : پانتۆڵێکی تەسـكو کراسـێکی نەشازی لەبەرە .

٥ ــ شێرکۆ : جلێکی ئاسایی لەبەرە .

٦ ــ گوڵناز : جلێکی لادێی لەبەرە .

٧ ــ کاوە : جلێکی مێژوویی لەبەرە ( لە چەرم بێت باشترە )

٨ ــ کەسی یەکەم

٩ ــ کەسی دووەم لەناو بینەران دادەنیشن.

١٠ ــ کەسی سێیەم

١١ ــ پاڵتۆلەبەرێك

« شانۆ دەکرێت بە دوو بەشـەوە ، لای چەپ نوسەر لەسەر کورسیو مێزێکی لەپێشەو تەنیشتی لە بینەرانە . لای چەپیەوە دەرگایەك هەیە بۆ هاتوچۆکردنی ئافتـاو . ئاوێنەیەك ڕووبەڕووی بینەران هەڵواسـراوە . لای ڕاستی شـانۆ پێنج سندوق هەیە لە شێوەی تابووتو پـەردەی ڕەنگاو ڕەنگیان پێوە هەڵواسراودو هەرێەکەیان ژمارەیەکی لەسەر نوسراوە ، لەگەڵ پیتێك ( ١ ــ پ ) (٢ ــ ێ ) (٣ ــ ش) (٤ ــ ا) (٥ ــ ن) کـە وشـەی (پێشـان) پێکدێنـن . لای سـنووقەکانـەوە دارێکی پیرەڵۆك دیارەو لەژێریدا ، نموونەی کتێبێکی گـەورە کراوەو لەسەری نوسراوە (پیاچوونەوە .. یەك پەردە)

**پێشەکی**

**یەکەم**

« سێری کاتژمێرەکەی دەکات » ئەوە بۆ پەردە لانابردرێت ؟ « لەناو خەڵکەوە دەچێتە سەر شانۆ » بێدەنگبن .. « لە درزی پـەردەکـەوە دەڕوانێ » هیچی ئەوتۆ نابینـم .. لـەو.هینـانە بـەولاوە .. « دێتەخوارەوە » هەرچۆنێك‌بێت پارەمان داوە .

**دووەم**

« دەچێتە سەر شانۆو لە درزی پـەردەکـەوە دەڕوانـێ » هیچـم لێـوە دیار نییـە ! «چاو هەڵدەگلۆفێ» .. نا .. ئەو هینانە چین !؟ « بـە پەنجە ژمارەیان‌دەکات » .. پێنج هینن .

**سێیەم**

« لەناو بینەرانـەوە » دە وەرە خوارەوە . وا پەردەکـە دەجولێتـەوە « دووەم بـە ئاسـپایی دێتەخوار » ..

**[ تابلۆی یەکەم ]**

« تەنیا پەردەی لای چەپەوە هەڵدەدرێتـەوە . نوسەر بە دەنگی بڵند دەنوسێت »

**نوسـەر**

هەیە ووشـەکانی لەسەر لم دەنوسێو شـەپۆل دەیانسڕێتەوە . «سەر هەڵدەبڕێ» ئافتاو .. ئاو .. ئاو .. ئافتاو .. «ئافتاو بێدەنگ دێتە سەر شانۆو پـەرداخێـك ئاو لـەسـەر مێزەکـەی دادەنێو دەگـەڕێتـەوە . نوسـەر بـەردەوامـە لەسـەر نوسینەکەی» .. هەشە بە خەڵوز لە قەد دیوارەکان دەنوسێو بارانێکی شێت ، ووشەکانی دەسڕێتەوە . ئافتاو .. ئاو «ئافتاو پەرداخێکی تر دێنێو لـە تەك پەرداخەکەی تر دایدەنێو دەڕوات» .. ڕستە ئـەوە نییە کە بەرجەوەنی خۆش‌بێو خترووکە بە لەش بدات. من دەمەوێ بە نینۆك ووشەکانم لەسەر تاشە بەردو تاوێردا هەڵکـەنم «دەوەسـتێ» .. بۆئـەوەی نـە شـەپۆلی دەریاو نـە بارانی هاروهاجو لـەنگێـزە ، نەیانسـڕێتەوە . ووشە چەقۆیە ، قوڵنگە ، سەنکە ، چەکوشە ، پشکۆیە ، دڕکەزێیە . ئافتاو ، ووتم ئاو ، ئاو «ئافتاو دیسان پەرداخێکی دیکە لەسەر مێزەکـە دادەنێ»

**ئاقتاو**

قوربان ، ئەوە ئاوەکانـــە «نوســـەر ســـەر بەرز دەکاتەوە» لە هەر کامەیان دەنۆشـی ئاردزووی خۆتە «پەنجە بۆ پەرداخی یەکـەم ئاراســتەدەکات» ئـەمەیان لەو ساردترەو ... «پەنجـە بۆ پـەرداخی سێیەم دەبات» ئەمەشیان کەللەتەزێنە ..

**نوســـەر**

« بە گومانەوە ، دەڕوانێتە تـەوێلی ئاقتــاوو پەرداخەکان » سییان بەجارێ !!

**ئاقتــاو**

قوربان ، بەڵام تەمەنیان جودایە «نوسەر وەك هەلوربەلوربکات ، پـەرداخی ناوەنـدی هـەڵدەگرێ قومێکی لێدەخواتەوە . لەگـەڵ پـەرداخی یەکـەم‌و سێیەمیش هەر وا دەکات» تەمەنی چی‌و کاتی چی ! ئاوی ڕووتن‌و هیچی تر . ! «ڕوو لە بینەران دەکات» مرۆڤ دەستەپاچەی کات‌و گۆڕانە . «بێدەنگی» کاتی ژیاوی تەمەنمان نـەوەك ڕۆژژمێـری هەڵواسـراوو کاتژمێـری ئامێـر .. مـن ئاوێکی ڕەنگالم دەوێت تینویەتی بشکێنێ‌و ... «لـەگـەڵ خۆیا» .. کات روبارە ... تاڤگەیـە .

**یەکـــەم**

« لــە لای ڕاستی بینەرانەوەیــە » کـەواتە ، شەربەتی مێوژ !

**دووەم**

« لە ناوەندی بینەرانەوەیە » کەوابوو ، وێـسکی!

**ســـێیەم**

« لە لای چەپی بینەرانەوەیــە » .. دۆشـــاو ، دۆشـــاوی خورما ! .

**نوســـەر**

« لەگەڵ خۆی دەدوێ » ئاوێکم دەوێ پاراوبێ لە درۆ ، ئاوی ڕاستەقینەی ...

**یەکـــەم**

« قسـەی پێدەبڕێ » .. جا ئەو ئاوە هەیە !؟

**دووەم**

لە کوێیـــە ؟

**ســـێیەم**

هەیە ؟ لە کوێیە ؟!

**نوســـەر**

« گوێ بەوان نادا‌و دەنوســێ » داچڵەکانی کات لە نوستن‌و زیندەخەوو ئەندێشـەدا ، تـەوژمدارتر‌و ڕاستکۆتر دەبێت « وەك ونبوویەك بدۆزێتەوە » ئـەو ئاوە مەگەر .. « ڕوو لە بینەران دەکات‌و دەست بۆ ســنگی دەبات » .. مـەگـەر لێـرەدا هەبێت ، خۆ دۆزینەوە ، واتـــە : خۆ ڕاگرتــن لـەناو روبارێکی جیوەیی‌دا « هەڵدەستێ . ڕوو لە پەردەی ڕاســت دەکات » .. داخی ئەم پەردەیەش « لای‌دەبات » .. لە هەمووی گرانترە « ڕوو لە بینەران دەکاتەوە » ئای لە ئێوەش ! دەتانەوێ نەبینراو بخەمە پێش چاوتان ! جارێك لە سانت ئۆگۆستینیان پرسی : کات چییە ؟ ووتی : ئەگەر پرسیارم لێنەکەن ، دەیناســم ، بــەڵام ناتوانم ڕاڤەی‌بکەم ، ناتوانم .

**یەکەم‌و دووەم‌و سێیەم**

« بە یەك دەنگ » ئێمەت بۆ شانۆگەرییەکی یەك پەردەیی وا ڕاکێشاوەتە ئێرە !؟

**نوســـەر**

خۆتان هاتوون « ئێســـتێك » .. بۆ یـــەك پەردەتان بۆ شی‌دەکرێتەوە ! هەتاکو داوای چەندین پەردەم لێبکەن !؟ ئێوە عەودالی شتێکن ، خۆشـتان نازانن چییـە . « پەنجە بۆ تابووتـەکان درێژدەکات » وەك ئەوانە ، کە نازانن چییـان تێدایـە ، یـەك .. دوو .. سێ .. چوار .. پێنج «لەسەرخۆ» پێ ... شا ... ن ، پێشـان «وشـەکە لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا بەجۆرە ئاوازێك دەڵێتەوە»

**یەکـــەم**

نێ ، بابزانین

**دووەم**

وا چاوەڕوانین

**سێیەم**

هەموو چاووگوێین

**نوســـەر**

« دەگەڕێتەوە لای تابووتی یەکەم ، پەردەکـەی هەڵدەداتەوە ـ زەلامێك دەردەکـەوێ کـە وەك بت وەسـتاوە ، مرادخانییەکی دوورەنگی شڕی لەبـەرەو سواڵە گەنمێکی بە دەستەوەیە » بارام .. بارام .. «بێدەنگی» ئاقتاو .. ئاقتاو

**ئاقتاو**

«دێتە سەر شانۆ» فەرموو قوربان .

**نوسـەر**

دیارە سڕبووە ! خۆ بە بت دەکات .

**ئافتاو**

ئەی .. خۆت .. نەتکوشت !

**نووسەر**

«وەك بیربکاتەوە» کوشتن ! نا ، نا ، بەڵکو ژیانم لێ قەدەغەکرد «ڕوو لە بینەران دەکات» وابزانم جیاوازیش ئاشکرایە لەنێوان هەردوو ووشەکەدا . «ڕوو لە ئافتاو دەکاتەوە» شووشەی یەکەم بێنە «ئافتاو دەڕواتو نوسەر لەسەر مێزەکە دەنوسێت» ووشە هەیە بەتاڵە ، قاووغە ، ووشەش هەیە کردارە کاکڵەیە ، بگۆرە «سەر دادەنەوێنێ» بەڵێ کردار ، کردار ..

**[ تابلۆی دووەم ]**

«ئافتاو شووشەی یەکەم دێنێو پارچە لۆکەیەکی لێ تەڕدەکاو دەینێ بە لووتی بارامەوە»

**بارام**

«دوو سێ جار دەپشمێ ـ چاو هەڵدەگلۆفێ» بەڵێ ، من بارامم ، کێ داوامدەکات ؟

**نووسەر :**

«وەك ئەفسەرێك» وەرە پێشەوە .

**بارام**

«وەك مرۆڤێکی دەستکردە (رۆبۆت) هەنگاو دەنێ ـ ئافتاوە لەپشت نوسەرەوە ڕاوەستاوە ـ شانۆ لەگەڵ هەنگاوەکانیدا تارێكدەبێت» فەرموودەی خۆتە کە ڕابردووو داهاتوو دەبێ لە ئێستادا کۆببێتەوە بۆیە وام لەبەر دەستتا ..

**نوسەر**

بگەڕێرەوە ڕابردووت بۆنەوەی داهاتووت بەدیبکەین .

**بارام**

ناتوانم .

**نوسەر**

«بەتوندییەوە» دەتوانی ، دەتوانی چونکە ڕووداوەکانی ئەو دیوی هەستت لە کاتو سنوور بەدەرنو لە وزەشتدایە هەر ئێستاکە ، ئا لێرەدا کەڵەکەیبکەیت .

**بارام**

بابزانم ! «ڕابردووی دەنوێنێو ڕووناکی ئاراستەدەکرێت . نوسەرو ئافتاو لە تاریکاییدان» مەچەکو بازووم تامەزرۆی داسو هەوجارن ، ئێستا لە کوێم ؟ شار ! هەر شارێك بە من چی ! هەر دەگەڕێمەوە ، بەڵێ هەر دەگەڕێمەوە بۆ ئامێزی سروشت ، ئەگەر ئەمڕۆش نەبێ سبەی ، دووسبەی ، با دەساڵی تریشبێت «بێدەنگی» ئای چەند تاڵە ئەو ڕۆژگارەی کە لە کەسوکارت دووربیت . نامۆبیت . بە سەربەرزیو بێترس دەچمەوە . شاتووەکە ، شۆڕەبییەکە ، دەبێ مابن ! نەشمابن نەمامی تر لە جێیان دەنێژم(١)

**نوسەر**

بەسە ، بەس «شانۆ روناك دەبێتەوە» دەگەڕێیتەوە «بەتەوسەوە» دەگەڕێیتەوە !! کام تەلیسم ، کام شەیتانی نەگریس دەتگەڕێنێتەوە ؟!

**بارام**

جا قوربان خۆت ئەو ڕۆڵەت پێم سپارد ! وەك خوونەڕێتی ئەوسا ...

**نوسەر**

خوونەڕیت ، خوونەڕیت ( بە توڕدییەوە ) خوونەڕیت ئەوەیە خەڵك دەیەوێ ، نا ؟ « ڕوو لە بینەران دەکات » ئۆباڵی هەر نوشستییەك دەخەنە ئەستۆی من ! بەڵام داهێنانو سەرکەوتنەکانم ژێر لێو دەخرێ « لەگەڵ بارامدا » دەگەڕێینەوە .. زۆر جوانە . هەر دەبێ بشگەڕێیتەوە ، بەڵام چۆن ؟ بە باڵی سیمرغ ! یان دەبێ سێوەکە بکاتو هەموو شتێك ڕێبازی مێژوویی خۆی وەربگرێتو ....

**بارام**

« قسەی پێدەبڕێ » بەڵام قوربان خۆت ...

**نوسەر**

« ئەمیش قسەکەی دەبڕێ » دەمت کلۆمدە ، من ئەوساکە گەمژەبووم ، پێتخۆشە ، بیری ڕەبەنیو هەرزەکاریمبوو . دەمویست دیاردەو ڕووالەتەکان بە پەنجە بگۆڕم ! « لەگەڵ خۆیا » هەر لەسەر کاغەز ئەگینا ، هەرشتێك لە بۆشایی سەرهەڵدات ، وەك خاپۆرەی منداڵان دەرمێت « لەگەڵ بارما » بۆ جێگای خۆت . دەی جێگای خۆت .

**بارام**

ناڕۆم . ڕۆڵێکی ترم پێبسپێرە .

**نوسەر**

ووتم برۆ « ڕوو لە بینەران دەکات » دەیەوێ وا بە ئاسانی ڕێبازی دەرەبەگایەتی ئاڵوگێر . بکات « پێدەکەنێ » فیلمی میسری دەردەکات

**بارام**

با ڕووداوەکە لە نووکەوە دەستپێبکەم .

**نوسەر**

چی لە بارەکە دەگۆڕێ ! ئاڤتـــاو شـووشـەی دووەم .

**ئاڤتاو**

« لۆکەیەك لە شـووشـەی دووەم تەڕدەکـــاو دەینوسێنێ بە لووتی بارامەوە ــ بێخود دەبێو بەرەو سنووقەکەی خۆی پەلەکێشیدەکات — پەردەکـــەی دەدداتەوە » وەك بەر گوێم کەوت ، ناوی شـەیتانت برد ! تۆ بڕوات بە بوونی هەیە !

**نوسەر**

بەڵێ ، بەڵام کێیە ؟ « ڕوو لە بینەران دەکات » شەیتان خۆمانین . منم ، ئێودن ، ئاڤتاوە ، بارامـــە « پەنجە بۆ سنووقەکان دەبات » ئەوانە هەریەکەیان شەیتانی خۆیانن .

**ئاڤتاو**

کەواتە . .

**نوسەر**

کەواتە هەریەکـــەمان دوو مرۆڤینو هەمیشـــە ئەو جووتە مرۆڤەی ناوەوەمان لە ملانەو زۆرانبازیدان، بەڵام مرۆڤی مرۆڤ ئەو کەسەیە کە خۆی دەناسێو هەست بە شێتی خۆی دەکاو دەشزانی مردن هەیە « لەگەڵ خۆیا » مزنایەتی ئەو مرۆڤە پیرۆزە لەوە دایە کە سەرەڕای مەرگیش ورە بەرناداو هەنگاو بەرەو خۆر دەنێ .

( تابلۆی سێیەم )

« نوسـەر ئیشـارەت بۆ ئاڤتاو دەکات ، ئەویش لۆکەی یەکەم دێنێو ڕوو لە تابووتی دووەم دەکات ــ پەردەکە لادەباتو لۆکەکە بە لووتی شـوانەوە دەنێ »

**شوان**

« دەپشمێ » بەڵێ قوربان «چاو هەڵدەگلۆفێ» هەر ئێستا شعرەکەم دەخوێنمەوە « هەنگاو بـــۆ ناوەندی شانۆ دەبات »

دڵدارەکەم ، هەرچەند دەکەم
لە عاستت ووشەم دەتاسێ .
دەریای بێ پەیم وەك ئەسکیمۆ دەماسێ .
تاکە ووشـەیەك لە فەرهەنگی سـانسـکریت
دەهۆنمەوە پیت بە پیت
بۆئەوەی ناوی تۆ .
وەك گەردانەی یاقووت ، لە گەردنی ئاسـۆ
خۆی هەڵواسێ .
دڵدارەکەم . لە کرنووشـی ناو مزگەوتی ،
هەتیوا ناووت دەبەم .
لە جەرگی لالەی بێ ئەوتی ،
لە پایتەختی ،
تەم ، هەنگاوت هەر بۆ دەبەم .
دڵدارەکەم.. کەی هەر دوو لەگەڵ شتراوسێ،
لەناو ڕەنگی گۆگان ،
دەبین بە دراوسێ ؟ (٢)

**نوسەر**

« لەکاتی خوێندنەوەکەدا سـەر دەلەقێنێ وەك گومانی هەبێو ناقایلبێ » بیبڕەوە ، زۆر مەڕێـــە ، سازندەییو چەنوزیم ناوێ «ڕوو لە بینەران دەکات» دەڵێی بازرگانی ووشـەیە ووشـە ، ووشـە ، ووشـەی دمبا ، کۆلارەی ڕەنگاوڕەنگ ، هەریەکەیان چیرۆکێکن، بەڵکو چەند چیرۆکێکن .

**شوان**

ئاخر . . . قوربان . .

**نوسەر :**

دەزانم ، دەزانم تۆش وەڵامەکەی بارامت هەیە ، هەمووی لە ئەستۆی منە ، نا ؟ جا بۆ کۆمەك ناکەنو بمکوژن ! ئەوساش ئێوەو ئاژاوە ، ئێوەو سەرکێشی ، ئاشووب ، ڕەوەکی ( ڕوو لە بینەران دەکات ) لای خۆی ڕۆشنبیردو دەبوایە شوان بوایە ! ( ڕوو لە شوان دەکات )گرنگ ئەوەیە هەبیت و بگۆڕیت . مەبەستیشم لە بوونە فسیۆلۆجییەکە نییە . بوونیکی ڕاستەقینەی تێکەڵ بە مەبەستە پیرۆزەکان ، ئەگینا بەرد ، دار ، ئاسن ، جیوە ، ئاو هەموو هەنو هیچیش ناگۆڕین .

**شوان**

بەفر دەبێ بە ئاو . ئاویش دەبێ بە هەڵمو . . .

**نوسەر**

مەنتیقە شەلەکەیە ! بەڵام بەچی ؟ کەی دەبێ بە باران ! چۆن ؟ من دەمەوێ مێشك بخرێتە کار ، ئەگینا هەمرو ، درۆیەکی زلین ، مێژوویەکی شێواوین . .

**شوان**

« ڕوو لە ئاڤتاو دەکات » خۆ مەفەرم نادات !

« ڕوو لە نوسەر دەکـــات » دان بەخوتابگرە

« شـانۆ تارێك دەبێت ــ تیشکێ روناکی لە شوان دەدات کە پاشماوەی ڕۆڵەکـەی دەنوێنـێ » بۆیـە

بڕیارم داوە لەم ئوتێلە بگوازمەوەو ببڕای‌ببڕای لە ژووری سەرباند جێنشین نەبم ، بڕیاریشم‌داوە «هەنگاو دەنێ‌و بازنەی رووناکییەکە دوای دەکەوێ» بڕیاریشم‌داوە کە تابلۆیەکی نوێ بۆ بوونی خۆم بکێشم‌و شەقامەکانیش بکەمە چوارچێوەی ئەو تابلۆ رەنگینەو ناوەکەشی بنێم : ڕاچلەکینی مرۆڤێك کە ناوی ... بەلاّم هیچ پێویست بە ناو ناکات ، چونکە تەنیا ووشەی مرۆڤ ، هەر مرۆڤێك ، نیشانەکە دەپێکی‌و ئیتر منیش ئەو کۆترە کێویلەیە نیم کە بێجووەکانی ونکردبێ ، ئەمڕۆ ئاسۆم لێوە دیارە ، ئاسۆش ئارامگای زاوزێ‌کردنی ئاسمان‌و زەوییە .

**نوسەر**

« جەپلە لێدەدا » جوانە ، هەر بە ووشەو سەرواوکێش « بەتوڕەیی » بەلاّم چۆن ؟ چۆن ؟ ڕینمات چییە ؟ بە بەلەسەیی برین سارێژدەبێ ! « شوان دەیەوێ دەم بکاتەوە ــ بوسەر بە لەپ دەمی دەگرێت » .. ئۆبالێ منە ، نا ؟ ئافتاو « دوو پەنجەبلند دەکات ــ ئافتاو لۆکەی دووەم بە لووتییەوە دەنێ‌و ڕاپێچی‌دەکات بۆ ناو تابووتەکەی ــ پەردەکە دادەگرێت » « ڕوو لە بینەران دەکات » ئەوا ووتمان : هونەرمەند بومەلەرزەیەو لە زەویی ڕەقەلاّنیشدا گولی ڕرواند ، بەلاّم بۆ « سەر بۆ تابووتەکان درێژدەکات » بۆ بە گوێردی وزەو توانای خۆیان هەلوێست هەلناگرو ؟ « دەچێتە لای مێزەکە ــ بە دەنگ دەنووسێ » دەبێ سیپارەی پێشرومان لەگەل پەلکەرەنگینەی داهاتوومان‌دا لەناو بۆتەی ئەمڕۆماندا هەلشێلین « سەر هەلدەبڕێ ــ ئافتاو ئاوێنەکە دەسڕێتەوە » ڕابردوو بە من چی ! داهاتوو بە ئێوە چی !

**ئافتاو**

ئەی مرۆڤ بۆ پێدەکەنێ ؟

**نوسەر**

پێکەنین شۆرتی مێشك‌و بیرکردنەوەیە «بێدەنگی» .. لەناو منداڵدانەوە بڕیاری بیرکردنەوەمان بەسەردا بڕاوە ، بۆیە پتر دەگرین لەوەی پێبکەنین « لەگەل خۆیا » .. ئای چەند بەرینە ، کەناری داهاتوومان ! بەلاّم من ئەمڕۆم دەوێ « دەست بۆ بینەران دەبات » ئەمڕۆ ، ئەمڕۆ ئەمڕۆ ..

( تابلۆی چوارەم )

«ئافتاو دەست بۆ لۆکەی یەکەم دەبات ــ نوسەر بە سەرلەقاندن ، نارەزایی خۆی دەردەخات . ئافتاو لۆکەکە دەنێ بە لووتی شێرکۆوە » (٣)

**شێرکۆ**

« دەپشمێ ــ چاو هەلدەگلۆفێ ــ سەری سوردەمێنێ‌و هەنگاو بۆ چەقی شانۆکە دەبات » کێ هێنامییە ئێرە ؟ من لە کوێم ؟ « شانۆ لەسەرخۆ تاریك دەبێت » شیرین .. شیرین « داوێنی ئافتاو دەگرێ‌و بە شیرینی دەزانێ » شیرین ، توڕەییم چەشنی ڕووبارێکی تیژڕەو ، بەلکو وەك دەریایەکی بێبن ، شەپۆلە هاروهاجەکانی بە هەر لایەکدا بلند دەبنەوە ، بگرە دلۆپە زیوینەکانی ، لە ناخمەوە هەلدەچن‌و دەبن بە هەلمی قین‌و سەرلەنوێ دەبنەوە بە تۆپەلەی قورقۆشم لە عاست مرۆڤی نا مرۆڤ . خۆزگە ڕۆژگار زمانی دەبوو . بریا کەناری زەریاکان دەدوان ، ئەوسا چ داستانێکیان لە فرمێسك‌و هەنسك‌و خوێن دەهۆندەوە ! چ پەیکەرێکیان بۆ نامرۆڤەکان دەتاشی ! « داوێنی ئافتاو بەردەدات‌و ڕوو لە بینەران دەکات » گوایە هیچ سنوورێك لەنێوان مرۆڤایەتی‌و دڕندایەتیدا نییە !! بۆ هەر لەبەر شەوەزەنگە ، بەهیوای شەبەقێکی ڕوونین ! یاخود لە حەشمەت دۆزەخی زان‌و بەژارەیە، ئاوات بۆ بەهەشتی ئەوین‌و دلداری دەخوازین ! یان لە سایەی بەدکارییەوە نرخی چاکەخوازی دەزانین ! یانیش لە نەفرەتیی دزێوییە ، پێوانە بۆ جوانی دادەنێین ! نا .. نەخێر ، هێزێکی کاریگەر هەیە . نهێنییەکی پیرۆزە کە هەمیشە تامەزرۆی روناکی‌و چاکەو ئازادی‌و جوانی‌و دلداریمان دەکات ، ئەویش وا « دەست دەخاتە سەر دلی » لێرەدایە . لێرەوە چەکەرە دەکات‌و ڕەگ دا دەکوتێ ، ئەمیش ماکی مرۆڤایەتی‌و هەوێنی بوونمانە ، بە پێچەوانەش ژیانمان دەبێتە مەتەلۆکەی شێرو ڕێوی « بەتوندیی » نا .. ژیان سەرگوزەشتەی ناو ئەو جەنگەل‌و بێشەلانانە نییە کە داپیرەکانمان ، لەبەر گۆیی ئاگردان ، برسێتیی ئارەزووەکانمانیان پێ لە بیر دەبردینەوە .

**ئافتاو**

« چەپلەلێدەدات » ئافەرین .. ئافەرین .

نوسەر

ناتەواوە ، ناتەواو « ڕوو لە ئافتاو دەکات » نەهاتووینەتە ئێرە بۆئەوەی چەپلەمان‌بۆبکوتن .

« لەگەڵ خۆیا » قین ! خۆزگە ! بریاو چەند هەستێکی دامرکاو هیچ نابزوێنن . تەنیا بەقین هەڵگرتنو پاسار دانەوەی دڵ ، کارەکە مەیسەر نابێ . خۆزگەو بریاش، نەزۆکن . « ڕوو لە بینەران دەکات » وا خەریکە بەئاگابێو خۆی بدۆزێتەوە .

**شێرکۆ**

بەڵام ..

**نوسەر**

دەزانم . دەمت بنووقێنە « ڕوو لە ئافتاو ددکات » ئیتر دەبێ نەخشەیەکی دیکە بکێشم بۆ دروستکردنی پاڵەوانی تر . دەبێ دیکتاتۆرانە ، ڕۆڵەکان دابەشبکەم . ئەمڕۆ ... « شێرکۆ لە درزی دەرگاکەوە دەڕوانێ » سێری کوێ دەکەیت ؟ وا دەتبینن « هەردوو شانی دەگرێت » دەزانی لە سەنگەردا ، درۆزنو ڕاستگۆ ، پاڵەوانو ترسنۆك ، بێگەردو دووڕوو ، چی کۆیاندەکاتەوە ؟ « بێدەنگی » یەك شتێکو بەس ، یا دەکوژرێن یا دەکوژن .

**ئافتاو**

کەوابوو « لۆکەی دووەم هەڵدەگرێ ـ دەینێ بە لووتی شێرکۆوەو لە پشتەوە ، پاڵی پێوەددنێ ـ پەردەکە دادەداتەوە »

( تابلۆی پێنجەم )

**نوسەر**

چوارەم « ئافتاو لۆکەی یەکەم هەڵدەگرێو ڕوو لە تابووتی چوارەم دەکاتو هەمدیسان بە کارەکەی هەڵدەستێ »

**گوڵناز (٤)**

« دەپشمێو بە دەنگێکی گەورە » باران .. باران ، خوایە باران . « شانۆ تاریك‌دەبێت ـ دەچەمێتەوە هەرودك لەگەڵ تەرمێکدا بدوێت » زۆراب .. زۆراب « سەرهەڵدەبڕێ هەروەکو لەگەڵ کەسانی دەوروبەر بدوێت » ها .. چاوەڕوانی چین ؟ « ڕوو لە بینەران دەکات » دەتانەوێ بگرین ! بۆ کێ ؟ گریان دادناداتو کروزانەوەش ناسۆرەکانمان سارێژناکات . ئەوەی قایل بە گریانە با لە ئێستاوە خۆی دابڕێت . باران ، باران خوایە باران . ئەزانن بۆ ؟ دیارە لە دڵی خۆتانا دەڵێن کەی پێویستیمان بە بارانە ! بەهەڵەداچوون . ئەمڕۆ لە هەر ڕۆژێك زیاتر پێویستیمان بەو بارانە هەیە ، بارانێکی بە گوڕ ، لێشاو ، با کەسێك دەم بکاتەوەو بڵێ بۆ ؟ «ئێستێك» ئەو بارانەم بۆئەوە ناوێ کە تینوویەتی دەغڵو دان بشکێنێتو گوڵەکان قەوزەی پێ بگرن. هەمووبپرسن ئەم بارانەم بۆ چییە ؟ ئەزانن بۆ ئەوەی « ووشەکان دەکرۆزێ » ئەو دڵۆپە.. خوێنە.. لەسەر .. ئەو.. بەردە نوێژە .. بشواتەوە ... بشواتەوە ...

**ئافتاو**

« شانۆ روناکە » ئەی ئەمەیان ؟

**نوسەر**

با بگەڕێتەوە جێگای خۆی ئەوسا « ئافتاو بە کاری پێویست هەڵدەستێ » ئافتاو ، ساکاربوو ، ساکار . کەفو کوڵێکی کاتیو فەریك‌بوو ، بەڵام دەشێ هەنگاوی لێوە هەڵگرین . « دەچێتە سەر مێزەکەو دەنووسێ » دەبێ هەموو توانایەك بەشداری‌بکات .

**ئافتاو**

ژن نیوەی کۆمەڵە .

**نوسەر**

« سەرزەنشتی‌دەکات » تۆ واز لەو دروشمە دابڕینە بێنە . ببرای ، ببرای من پیاوو ژنم نەووتووە، بەڵکو هەمیشە دەڵێم مرۆڤی کردار نەك ...

**ئافتاو**

« دەچێتە دەرەوە ـ نووسەر دەستی لەژێر چەناگەیەتی »

( تابلۆی شەشەم )

**دەنگی ئافتاو**

ئیشی هەیە .

**دەنگێکی زل**

ئیشی هەیە ، ئیشی هەیە ، منیش ئیشم هەیە !

**دەنگی ئافتاو**

مەچۆرە ژوورەوە ، قەدەغەیە .

**دەنگی کابرا**

دیارە تۆش ...

**دەنگی ئافتاو**

ئاخر ..

**دەنگی کابرا**

دەلاچۆ .

« پالتۆ لەبەرێك دێتە سەر شانۆ ــ زەلامێكی چەتەولە ، دارێكی بە دەستەوەیە ــ لە ئاوینەكەدا سەرو سمێلی باش دەكات ــ دەڕوانێتە نوسەرو گاڵتەی پێدێ ــ زوورە بە چاو دەپشكنێو لە راست تابوتەكان سەر ڕادەوەشێنێ ــ دەڕواتە دەرەوە »

**ئافتاو**

« دێتە سەر شانۆ » .. دیت ! ؟

**نوسەر**

« لەبیركردنەوەكەیدا ڕادەچڵەكێ » چیم دی !

**ئافتاو**

« بە پەنجە هێلی دەرەوەی زەلامێك دەكێشێ » نەتبینی ؟ !

**نوسەر**

« وا دەزانێ مەبەستی لە تابوتەكانە » .. با هەر بێنو بچن ، پەتەكانیان بە دەستی خۆمەوەیە .

**ئافتاو**

كەوابوو ، تابوتێكی تر . « بە كاری پێویست هەڵدەستێ »

**نوسەر**

دەمەوێ كەسەكانم بێ ڕووپۆشبن . تا لەسەر ئەم شانۆیەمەدا بژین ، نەك لاسایی بكەنەوە نەگینا تواندن ئاسانە وەك درۆ .

**كاوە (٥)**

« بە دەنگی بڵند دەپشمێ ــ چەكوشی بە دەستەوەیە » .. واهاتم .

**نوسەر**

« ڕوو لە ئافتاو دەكات » من ئەمەم دروست نەكردووە ! ! تابوتی پێنجەم بەتاڵبوو !

**كاوە (٥)**

ڕاستە تۆمنت دروستنەكردووە ، بەڵام مــن « پەنجە بۆ چوار تابوتەكە درێژدەكات » گیانی ئەو چوارەم . كاكڵەی بیرەكانیانم گوڵبـژێـركرد ، بەر كوڵەكانیانم ئاوێتەكردو بووم بەوەی دەمبینی .

**نوسەر**

« سەری سوڕدەمێنێ ــ ڕوو لە بینەران دەكات» بڕوابكەن ، تابوتەكـە بەتاڵبوو . خۆ بـە بەتاڵیش نامایەوە ..

« شانۆ تاریكدەبێت . كاوە دیمەنێكی پانۆرامی دەنوێنێ هەروەكو دیلبێو كۆتو زنجیر بپسێنێ »

**كاوە**

« شانۆ نیو روناكە » ئەو دواكەشـی خومان دەیزانین .

**ئافتاو**

هەموو دەیزانین

**نوسەر**

« چەكوشەكەی كاوە دەگرێتە دەست ــ شانۆ تاریك دەبێت ــ كاوەو ئافتاو لە پشتەوە دەست لە مل یەك دەكەن » .. دۆزیمەوە ، دۆزیمەوە . دەبێ بەم چەكوشە ، لەو دێوی بێسوونا ، داستانێكـی ڕاستەقینەی سەدەی نوێتان بۆ بتاشم « لەئاوێنەكەوە سەرنجی خۆی دەدات » دەبێ ووشەكانم ئاوێنەبن .

« لەسەر مێزەكە بــە دەنگی بلـنــد دەنووسێ » جیاكردنەوەی واقعو بیركردنەوە ، تاوانو خۆفریودانە، ئەژدەهاك نە ماری لەسەر شان ڕوودابوو، نە گرفتاری ئالۆشێكی ترسناك بوو ، ئەژدەهاك مرۆڤێكـــی « دەوەستێ ــ ووشەی مرۆڤ ڕەش دەكاتــەوە » ئەژدەهاك درندە بوو . ئەڕژەنگێك بوو وەك نیرۆن، وەك كالیگۆلا ، وەك هیتلەر « ڕوو لە بینەران دەكات » ئەگەر شەیتان لە ئاسمان كەوتە خوارەوە ، خۆ ئەمانە لە زەویدا، بەناخی زەویدا چوون! «شانۆ بە بە كجاری تاریكدەبێت » ئەژدەهاك « دەیەوێ ناوێكی تر بڵێت بەڵام نایلێركێنێ » ئەژدەهاك ... ئەژدەهاكبوو .. ئەژدەهاك ، ئەژدەهاك ، ئەژدەهاك .

( پەردە دادەدرێتەوە )

كەركووك ٢٢ــ٧ــ١٩٧٨

(١) دیالۆگی بارام لە چـیرۆكی (بارام ناوێـك هەبوو) ڕۆشنبیری نوێ ، ژمارە (٥٢) .

(٢) پاڵەوانی چیرۆكی (لەناو گەدەی نەهەنگێكدا ــ بەیان ، ژمارە (٣٢)

(٣) پاڵەوانی شانۆگـەریی «كێ تاوانبـارە ؟» روشنبیری نوی ژمارە (٦٠)

(٤) پاڵەوانی چیرۆكی «گوڵناز» . ڕۆشـنبیری نوێ / ژمارە (١٣)

(٥) پاڵـــەوانێكـــی نۆیـــە ، نوســـەر دروستینەكردووە .

# سکالایەک

مجید ندیم

(١)

که منداڵ بووم
لەو دیو پەرژینو دڕکەزیی
باخی دۆستان رادەوەستام
گەلاتوویان پڕ له شاتوو
له کەلێنی تەیمانێکا لەدەستدەنام ،
لێشاوی شیرینوسووری
شاتوو ، گەلام دەلستەوە .
ناو رۆژنامەی تازه دەرچوو
لێشاوی ـ هەی رۆله رۆ ! ـ
دێرەکانی رۆژنامەکەی
دادەپۆشیو
نەم خوێندەوە .

(٢)

له زستانا گچکەوگەورە
دەمان زانی ئاسمان هەورە
خۆزگە ئەگەر کوچك بباری
گوجیلەو کنك بباری
با بباری
گوایا دەستەلاتو دەورە
دەبێ که مۆم دادەگیرسێو
فرمێسکی تەمەن دەرێژی
رازی سووتان هەڵنەرێژی
که گەورەبووم
له دوا تەلبەنی سوپاکا
بوو دەمی مردوو ، سڕ بوو چاوەڕوانی
تا چاو بڕکا دوور ئەمڕوانی ،
گردە لمی سەحرای ووشکی
کلاوی ئاسن
تیشکی نیگام هەڵدەلووشن ..
بەلام ها . کا ، به گوڕوتاو
لەژێر هەوری بێدەنگیا
لێشاوی پرشنگی هەتاو
بنالێته ....
به بریقه دێتو لەناکاو
که دەڕوانم
هەر یەکێکیان شیرۆی منە
دەموچاوی گوله بەرۆژەی باکوورە
کوورەی رۆژی نیوەرۆیانی باشوورە

نزار قبانی

# چەند پارچەیەک لە یادداشتەکان

- ١ -

خواروی لوبنان داگیرکرا ...
ناوی ئەو لە ڕێزی وەرگرانی
جیرەی ئازوقە ... بە تانی .. شیری وشكو
خێوەتو چادر زیاد بوو .
چادرو خێوەت بۆ ئێمە شتێکی تازە نیە .
ئەوە ئاخرین ئوتێلی عەرەبی‌یە کە
هەر وەختێك لە هەموو ئوتێلێك دەریان
کردین ، پەنا بۆ ئەو ئوتێلە دەبەین .
ئەوە ئاخرین بەری‌میچە کە لە ژێری‌دا
رادەبوێرین ... بەڵام ئەو کاتە کە هەموو
بانێك بەسەرماندا روخا .
ئەوە پەناگایەکی رەسمی‌یە کە مردوەکانی
پێشو ، پێشوازی لەو مردوە تازانە
دەکەن کە پاش ئاخرین شکانی عەرەبان
بۆ لایان دەچن .

- ٢ -

چادر ... میراتی کۆن‌و تازەی ئێمەیە .
هەر ئەو جێگایەیە کە قاوەی تاڵی بۆن خۆشی لەگەڵ
هێل لێ دروست دەکەین .. عود لێ دەدەین .. پێ هەڵا
دەڵێ ین .
زەوزوومان دەبێ ... منداڵەکانمان زۆر دەکەین ..
چادرەکانیش یەک لە دوای یەک زیاد دەکەن .

- ٣ -

خواروی لوبنان داگیرکرا .. پارچە ئەرزێکی دیکە لە
خاکی عەرەب ئیسرائیل قوتی دا ... دەفرێکی دیکە
لە قاپەکانی خواردەمەنی زیادبو کە سی ساڵە لە
وڵاتانی عەرەبی دەیانخوا .
مادام کە خاوەن رەستورانەکانی ناتوانن رەستوران
بەرێوەبەرن لەبەرامبەر ئەو مو شتەریەدا کە دەخوا ،
دەخواتەوە ، دەنەرێنێ ، پارەی خواردن‌نادا بێدەنگ
دەبن ،
ئەو موشتەریە کە ئیسرائیلە مێزو کورسی‌و سفرەو
گارسۆن‌و ئاخرەکەی خاوەن رەستورانیش قـووت
دەدا .
لە شێوەی مردنیش‌دا ، دەکرێ داهێنان هەبێ ...
بەڵام ئێمە لە ژیانی خۆماندا دژی داهێنانو لە شێوەی

- ٤ -

سی ساڵە کە خەڵک گوشتی ئێمە دەخوا .
ئیسرائیل لە بەرامبەر شیشە کە بابەکان دانیشتوە
لێرەو لەوێ هەر جارە پارویەك هەڵدەگرێ ، هیچ
کەس نیە ، نەهێڵێ‌و پێشی پێ بگرێ ...
سی ساڵە گوشتی ئێمە بە شیشەوە دەکەن ...
سی ساڵە کە شەرەفی عەرەبی لەسەر ئاگری
ئەو شیشە کە بابانە دەگەرێ . سی ساڵە کە نەتەوەی
عەرەب لەسەر ئەم ئاگرە دەســـورێ ... خاوەن
رەستورانەکان پێکەوە ناکۆکیان هەیە ... دژی‌یەکتر
پیلان دەگێرن ...
داگیر کردنی خواروی لوبنان دەری خست کە هەموو
عەرەبەکان لە لیستەی خواردن‌دا هەن .. هێندێک
خوراون‌و ئەوانی تریش دەخورێن ...

- ٥ -

لەباری شیعرەوە سەرکـــەوتنێکی تازەمــــان وە
دەستهێنا .
جنوبی لوبنانیش لەگەڵ مەرسیەکانی تر کەوت ...
پیرۆز بێ ...

- ٦ -

هەر ئێستا شاعیری عەرەب بۆ رزگاری لوبنان
وەخۆ دەکەوێ .
بەڵام عەرەبەکان خۆیان نابزوون .

- ٧ -

داخـــوا دەکرێ مردنیش هەروەك جگـــەرە کێشانو
تومارو خواردنەوە ، ببێتە شتێکی ئاسایی ؟
رەنگە ... رەنگە ...
ئێمە عەرەبەکان لەساڵی١٩٤٨وە بەو مردنە ڕاهاتووین
هەر بەو شێوەیەش‌بۆ دنیای دیکە دەچیـن‌و هـــەر
بەو شێوەیەش بۆ ئارامگا دەگوێزرێینەوە . هەر بەو
شێوەیەش دەشکێین ،
هەڵدێ‌ین‌و لە ئەنجومەنی ئاسایش‌دا شکایەت دەکەین .
دا خوا چ قەبدێ دەکا ... تەنانەت بۆ جاریکیش
بێ ، شێوەی
مردنی خۆمان بگۆرین و یادەسکاری بکەینەوە ..
پارەی بۆ ژیان‌و نانی منداڵەکان‌و خەرجی قوتابخانەی
لێ‌پەیدا دەبێ ...

# ، بـريـنداريكى خـواروى لوبنــان

مردنیش‌دا
دژی داهێنان دەبزوینەوە .

— ٨ —

هەر بلیند گۆیەکی(١) عەرەبی بەرپرسی شکانێکــی ئێمەیە .. داخوا هیچ بیرتان لەوە کردۆتەوە کە ئەو بلیند گۆیانەی وەکی کێرد کەوتوونەتە گیانی ئـــەو نیشتمانە بیان ئەژمێرن ؟

— ٩ —

خواروی لوبنان داگیرکرا ... رۆژنامەکان نووسیان کە لە پەناگایەکدا
« عەنتەرەی کوری شەداد » یان دیتەوە جلی ژنانی لەبەر کردبو .
سەرۆکی پاسگا کاتێک تەماشای هەویەی دەکـرد ، لێی پرسی :
— داخوا تۆ ئەو حەماسە ئاگرینەکانت دەگوت ؟
« عەنتەرە » لەرزی لەکاتێک‌دا دەستی بە مەمك بەندی گرت بوو گوتی :
جەنابی سـەرۆک ، ئەوەی لە کتێب‌دا دیوتە بروای پێ مەکە ... من
ئەو « عەنتەرە » نیم کە تۆ بیرت لێ دەکردەوە .. من مادموازل « عەنتەرە » م ...

— ١٠ —

درۆیەکی مێژوویــی دیکەشیان دیتەوە کـــە نــاوی حاتەمی تایی‌بوو .
جانتابەکی پر لـــە دولاری بـــەدەستەوە بــو . جانتابەکیشی پر بو لە جەواهیراتی
ژنەکەی ... جانتای سێهەمی پربوو لـــە چەک‌و قەبالەو ئەو راقی بانک .
هیندێکیش ئەوراقی حیسابی جاری لە بانکەکانـــی نیۆیۆرک‌و
زوریخو لەندەن ...
— تۆحاتەمی تایی ؟
— نە خێر ...
ئەم دۆلارانە چن ؟
— ئەوەهی خێزانمە . خۆتان دەزانن چالاوێکی پچوکی نەوتی لە باوکیەوە بە میرات بۆبەجێ‌مابو ... ئەو چالاوە کەمێك

— منداڵە کانت لە کوێ دەرس دەخوێنن
— لە سویسرا ...
— وشترەکەت لە کوێیە ؟
— لەسویسرا
— ئەو ئەسپەی کە لە کتێبەکاندا نوسیویانە بۆ میوانت سەردەبڕی لە کوێیە ؟
— ئەوە هەوەڵین جارە کە حکایەتی ئەسپ و میوان دەبیسم .
بە راستی حکایەتێکی گاڵتەیە . بۆ پێکەنین دەبێ . بۆ ئاگاداریت
دەبێ بڵێم کە پیاوی وەک من موتەمەدین ... وەک من ...
گوشتی ئەسپ ناخۆن ... هەروەها بۆ ئاگاداری جەنابت
ئەو رۆژەی کە جمال عبد الناصر سالی ١٩٥٦ کانالی سونیزی
میللی کرد ، منیش بووم بە تەبەعەی سویسرا .

— ١١ —

تیلگرافو نامەی سەرەخۆشی‌و هاودەردی بە بۆنەی خواروەوە لە لایەن سەرۆکانی عەرەبەوە دەگەن .
مردنی جنوبی مردنێکی سادە نیە ... مردنێکە تەرمی هاوپیوەندی عەرەب بەسەر شانی‌دا دەکێشێ‌و
لە هەوەڵین چالاوی دەخات .

— ١٢ —

کاتێکی کوشتاری خواروم وەبیردێنەوە،ناچار کەربەلام وە بیر دێتەوە .... هەر ئەو وەحشی گەریە ...
هەر ئەو سەرە براوەکان ...
هەر ئەو خوێنانەی وەک خوێنی پاکی ئەهل‌و بەیت
تەنیا جیاوازی ئەم دو کوشتارە ئەوەیە کـــە ئیمام حوسێن ویارانی
بەشمشێرشەهیدکران ... خەلکی خوارو بە فانتوم لەئەنجامی گەوجی
عەرەبەکاندا شەهیدکران .

(١) بلیندگۆ : مایکرۆفۆن

# لێشاو

عبدالرزاق بیمار

گولم کەی گوڵ لەسەرسنگی مەبەستی پیسو ڕەش ئەدرێ
لە نیوەی شەو ئەبێ داوای چ خۆرێك پڕ بە ، دڵ بکرێ
گەلێ سەیرە ئەڵێن ئێمە لەلامان پێشەوا هۆشـــە
لەکۆڕی بێ‌بشوی مێشکا شەرابی باشەمان نۆشـــە
ئەگەر وابێ لەڕۆژێکا کە کەشفی ناو مەریخ ئەکرێ
ئەبێ بۆچی بەرەو کۆشکی ڕیا کرنۆش وەهـــابرێ
هەتاو زەوی لەکۆڵ نابو گەرا بۆ جۆرە کڕیارێ
کە پەروەردەی وەها جوانکات ئەسوتێنێ گەلای داوی
ئەگەرچی زۆر گەڕاو مانەو دەرونی هەڵپروکابو
کەچی ڕۆژێك لەلای هەرزە خەمی نیازی ئەدرکابـو
کەکاتێ هات مرۆڤی هەڵبژاردو خاکی لا دانا
وتی ئەم دایکە پیرۆزەت نەکەی ڕەش‌کەی لەتاوانا
هەتا ئەمڕۆش مرۆڤـو خاك بەبێ یەکتر ئەبوو ناژین
بەیەك بەخشینی یەکتریان بەهارەو دیمەنی شیریـن
کچی جوان بیری جوان چۆن کەی وشەی چلکـــن ئەدرکێنێ
گەروت بۆچی وتەی ڕاستی بەبێ ڕەحمی ئەتاسێنێ
هەتا دوێنێ لـە لای جوانی دڵت ڕەشماڵی هەڵدابو
لەگەڵ دێرو بزەی گەشدا هەمیشە یارو ئاشنابـو
زمانو کردەوەت ساتێ ئەوانی لا ئەبونایە
ئەبو هۆشو گەروو یەکســەر بەشوێن پێیدا بچونایە
ئەرێتی کۆنی بێ‌مەعنا لەلات جێگەی ئەبو هیچ دەم
گەلێ جار خۆت وتت بایەخ بەرازی هیچ پوچ نادەم
نیگاری نیشتمانی خۆت بـەگیانو دڵ وەها گۆش‌کرد
لەشیعری مەولەویو حاجی هەواری باوەڕت‌خۆش‌کرد
لە بیرمە لە ئەفریقا لەڕێی گەلدا ڕەشێ گیرا
هەمیشە بۆی ئەسوتایتو وەکو خۆت بی لەزنجیرا
گولم جوانان چییان لێ‌هات لەلات بۆ کام دەروشوێن چـون
لەسەر خواستت بەبێ تاوان پەژارەی کام سزاها تون
ئەبێت ئێستا لە بەردەستی کەساێکی مەزاتخانە
چ ئازارێك لەدڵیانا خەریکی جۆش‌و کوڵدانە
بەلام گیانە لەبڕوادانیە جوانی بە خۆڕایی
لەگەڵ کەسدا بە ئاسانی پەیاکا گیانی ئاشنای
ئەگەر هەستو دەرونی تۆ بەدڵ ڕێزیان ئەگرتایە
گومانی تیانیە هەرگیز بەدەرگاتا ئەهاتایە
بەلام گیانە دڵی ئاشنای فەروجوانی وەها ئاسان
ئەنرێتە دۆزەخی کورەی بەجۆشی دوکەڵو سوتان؟.
ئەگەر ئاوا وشەی ڕەش‌جێ وشەی جوانو سپی بگرێ
دەبا هیوای منیش قوربان لەبەرپێتا فڕێ بدرێ

# حەسۆو زەلێخا

فائق عمر توفیق

حەسۆ لاوێکی باڵا بەرزی جوانو دڵو دەروون پاکو لەسەر خۆبوو ، لە قەراغی دەریای ڕەشـــدا خەریکی شـــوانی بوو ، داوێـــن پاکیو نان بدەیی حەسۆی شوان بە جۆرێك لەو ناوچەیەدا دەنگـــی دابووەوە کە پیاو خراپو دزو تەنانەت گورگەکانیش دڵیـــان نەدەهات ئازاری حـــەسۆ یان پەلامـــاری ڕانەمەڕەکەی بدەن .

حەسۆ شمشـاڵ ژەنێکی بـــە توانا لێهاتوو بوو هەر کاتێك شمشـاڵەکـەی بنایەتـە سـەر لێوەکانی جۆرەها ئاوازی دڵڕفێنـــی لێدەهاتـــە دەرو مرۆڤی ڕاپێچی جیهـــانی ئـەندێشـــە دەکرد ، ئاوازەکانی گیاندارو بێگیانی دەهێنایە جۆشو بە جۆرێك کاری دەکردە سەر مێشكو دەروونی مرۆڤ کە وردە وردە ئاژەڵەکانی بۆلای ئەو دەنگە دەکـــەوتنـــە هەنگاو نانو ئیتر لە نزیکەوە ئەژنۆی دەشکاو ئەبووەوە بەردێكو توانای جووڵانو بیرکردنەوەی نەدەما .

حەسۆ هەمیشـــە ئـەڤینداری گوڵو گوڵزارو تەشنای خوڕەی ئاوو دەنگی بولبـولبووە لـە ژێـر سێبەری دارە بەرزەکانی قەراخ دەریای ڕەشـــدا لەسەر بەردێك دادەنیشتو دەستی دەکردە شمشاڵ ژەنین ، ئاوازە دڵڕفێنەکانی تێکەڵی بۆنو بـەرامەی گوڵو ڕەیحانە دەکردو جیهانی مۆســـیقاو گۆرانیو سەمای دروست دەکرد .

حەسۆی هونەرمەند بە جۆرێـك ڕانـەکـــەی ڕاهێنابوو هەر کاتێك بیویـــستایە بانگیـــان بکات بۆئاوخواردنەوەیانبۆ ســـەر ســـەوزاییـــەك یان بیویـستایە لـە دەوری خۆی گردیان بکاتـەوە ، نـە هاواری دەکرد ، نە دەیشی قیڕاند ، بـەڵکوو بۆ هەر بانگ کردنێك جۆرە ئاوازێکی تایبەتیی هەبوو کـــە مەڕەکانیشـی لەسەر ڕاهاتبوون ، لەهەر جێگایـەکدا بوونایەو هەر چەندە لە حەسۆوە دوور بوونایە ، بـە حاڵ گوێیان لە دەنگی شمشـــاڵەکـە ببوایـە ئیتـر بەســـەر دارو بـەرددا بازیان دەداو لـە دەوری کۆدەبوونەوە ، حـەســـۆی هاوڕێی مـەڕو هۆگری گوڵو خۆشـــەویستی هـەموان هەمیشـــە دڵەپاکەکـەیئاوازی کامـەرانیی لێدەداو ژیانێکـی ساکارو سادەی بەختیـاری دوور لـە خـەفـەتو ناخۆشیو پەستیی بەسەر دەبرد . چەند دڵشـــاد بوو ئـەم لاوە کـە لـە باوەشـی وولاتێکـی هێمنو سروشتێکی ڕازاوەدا پەروەردە بووە ، بێگومان دەبێت دەروونیشی وەك بەفری ســەر چیاکان پاكو بێگەرد بێت ، لەو ناوچەیەدا ئاغایەکی بێ ویژدان هـەبوو ، کیژێکی هەبوو بە ناوی «زەلێخ» ، بـەڵام زەلێخ چۆن زەلخێك .. ؟!

مەگەر هـەر خوا خۆی توانیبێتـی ئـەو تابلۆ ناسكو جوانە بنـــەخشـێنێت ، دوو چاوی ڕەش قەتران ، باڵای بەرز ، تەدی زراف ، جارێکیان بـە ڕێککەوت شوانەی دڵ پاك چاوی دەکەوێتە زەلێخ ، لە یەکەم نیگاوە دڵی شوانە دەپێکێت ، پاش ئـەم بینینە لە شەبەقەوە تا ئێوارە حـەسـۆ لەسـەر بەردەکەی دادەنیشتو بە هەموو تواناو زەوقێکەوە شمشالی لێدەداو پاشان دەســـتی دەکردەگریان . لەم لاشـەوە زەلخیش خـەمو خۆراکی لێ هـەڵگیراو بە تەواوی خووی دایە گۆشە گیریو بیرکردنەوە تاکە شتێك کە سوکنایی بێبهاتایەو تۆزێك دڵـــە بـێ ئارامەکەی پشووی بدایە ئەو ساتانە بوو کە دەنگی ئاوازەکانی حەسۆ لە گوێیدا دەزرنگایەوە .

هەردوکیان ئەوەشیان باش دەزانی کە نەریتی کۆمەڵایەتی هەرگیز بواری ئەوە نادات کـەکچی ئاغا ببێتە ژنی کابرایـەکی ڕەشۆکی وەك حـەسۆ بـەڵام خۆشـەویستی هەموو جۆرە نـەریتێکی کۆمەڵایـەتیو چینایەتی پێشێل دەکات .

ئاغا بەم پەیوەندیەی زانیو شێتگیر بوو بەڵام

دانی به خۆیدا دەگرتو دەیشاردەوە ، هەمیشە بیری لەناو بردنی حەسۆ دەکردەوە ، لە سەرەتادا بڕیاریدا بیکوژێت بەڵام پەشیمان بووەوە چونکە دەیزانی ئەگەر ئەم کارە بکات بە دەستی خۆی ئاگر لــە خــەرمانی خۆی بەردەداتو بــــە تــەواوی جێگاو شوێنی کۆمەڵایەتییان لەو ناوەدا نامێنێتو بنەماڵەکــەشیان هەتا هەتایە پەڵــەداری خوێنــی تاوانی کــەســێکی ناشایستە دەبێت کە هیچ جێگاو نرخێکی لە کۆمەڵدا نییە ، ئاغا لەم لاو لەو لاوە دەکەوتە بەر گوێی کــە ئەم دوو دڵدارە بە دزییەوە یەك دەبینن ، ئەم دەنگو باسە بە تەواوی ئاغای نیگەران کردبوو ، شەوی ڕۆژ دەکردەوەو ڕۆژی دەکردە شەو تا کونێك بدۆزێتەوە، لێرەی دڵی شوانە بپێکێت ، لە ئەنجامدا هاتە ســەر ئــەو ڕایــەی هەرچۆنێــك بێت دەبێت پیلانێکی وا بدۆزێتەوە کە شوانە لەو ناوە دوور بخاتەوە ، بۆیــە بە دوایدا ناردو پێی وت :

[ حەسۆ ، تۆ لاوێکی لێهاتووو هونەرمەندێکی بەهرەداریو ئەشزانم چیت لە مێشك و دڵدایە . تۆ چۆن بولبول عاشقی گوڵە تۆش ئاوا عاشقی زەڵخی منیت ، بیستووشمە کە شمشاڵ ژەنێکی باشیت ، من ئامادەم کچەکەمت پێشکەش بکەم بە مەرجێك :

لە خەڵکم بیستووە کە مەڕەکانت کاتێك گوێیان لە دەنگی شمشاڵەکەت دەبێت هەموو دێنو لە دەورت گرد دەبنەوە .

سەیری ئەو منارەیە بکە ، فەرمان بە دارتاشێك دەدەم کە پەیژەیەکی لە تەختە بۆ دروســــت بکاتو تۆش لە سەرەوەی منارەکە دانیشەو مەڕەکانت لــــە خوارەوەبن ، ئەگەر توانیتو بە شمشاڵەکەت وایان لێ بکەیت بێنە لاتو لە سەرەوە لە دەورت کۆببنەوە ئەوا لەمنەوە زەڵخ پێشکەش بە تۆبێت ، ئەگــــەر نەیشت توانیو دۆڕاندت ئەوا بێ چەندو چۆن کەڵو پەلەکانت کۆبکەرەوەو ئێرە بەجێبهێڵە ، خۆیشت چاك دەزانیت کە نەریتی کۆمەڵایەتی ڕێگەی ئەم داوایەی تۆ نادات ، واز لەم بەزمە بهێنەو جارێکی تر بیر لــە شتێك مەکەرەوە کە بۆت ئاکرێت یان نایەتە دی ] .

حەسۆی دڵدار وەك هەنگی لە داردا دۆزیبێتەوە ، بێ ئەوەی بیر لە داواکە بکاتەوە ووتی :ـ

( فەرمان ، فەرمانی بەڕێزتانە .. چـــۆن دەفەرموویت با وابێت داوای تەمــەنی درێژو لەش ساغیتان بۆ دەخوازم ) .

دارتاش هاتو پەیژەیەکی (٩٩) پلەی دروست کرد بەڵام لە ناوەڕاستدا پلەیەکیان زۆر بە سەلیقــەو هونەرمەندانە درزێکی وای تێداکردبوو بە هیچ جۆرێك هەســتی پێ نەکرێت هەرچییەکی بچێتە ســـــەر بترازێتو واش دەربکەوێت کە ساغە ، بەم پیلانــــە نامرۆڤانەیە دیارە مەڕەکان هیچیان ناگەنەلای حەسۆو ئاغای دەروونپیس گرەو دەباتەوەو بەم بردنەوەیەش دوو دڵی بێگەردی تامــەزرۆی یەکتر لێك دەکات .

حەسۆ دەچێتە سەر منارەکەو ئاغاش فەرمان دەدات زەڵخ ئارایشت بکرێتو بچێتە سەر بانەکەی بەرانبەر حەسۆ ، ئاغا ڕوو دەکاتە حەسۆو دەڵێت : ( سەیری زەڵخی خۆشەویستت بکە ئــەگەر داواکەمانت بـــە جێگەیاند ئەوا ژنی خۆتە ئەگینا هەرگیز داوای دۆستی نەکەیت ) .

زەڵخ چاوە ڕەشەکانی دەبڕێتە حەسۆ ، زمانی گۆ کردن ناگاتە لای حەسۆ ئەوە نەبێت بە دوو دەستە سپییە نەرمۆڵەکانی ئیشـــــارەتی بکاتو پەیمــانی خۆشەویستیی بۆ دووبارە بکاتەوەو بە زەردەخەنەی ناسك هیوا بخاتە دڵی شوانەوە، حەسۆ زۆر خۆشحاڵ دەبێت کە هەست دەکات زەڵخ لە هەموو دەروونیەوە خۆشی دەوێت نامێنێت پەڕو باڵ دەربهێنێتو ، بگاتە لای بە هیوای زەڵخو توانای خۆیەوە دەست دەداتــە شمشاڵەکەیو دەســـت پێ دەکات ، ئاوازی ئاواتو هیوای لێ هەڵئەستێنێت ، دارو بەردو گیاندارو بێ گیانی ئەهێنایە سەما ، کاتێك زەڵخ گوێی لێ دەبێت خەریك دەبێت لەو بەرزییەوە خۆی بخاتە خوارەوەو بێتە مەڕێكو سەربکەوێتە سەر منارەکەو لە دەوری حەسۆ دانیشێت . مەڕەکان هەموو لە دەوری پەیژەکە کۆ دەبنەوەو یەك لە دوای یەك ڕیز دەبەستن هــــەر یەکەو دەیەوێت لە پێشی ئەوی تریانەوە سەربکەوێتو بگاتە لای دەنگەکە .. [ هەی لۆ .. لۆ ، هەی لۆ..لۆ

ئەی شوانە هەژارەکەی دەریای ڕەش

تەنانەت کەژو دەشتەکانیشت هێنایە گریانو بۆ پەژارەی تۆ زۆر ئازاریان نۆشی ، بەردو سەختەکانت توانەوە ، بەچ عەقڵێکەوە بڕوات بە ئاغای خوێنڕێژو فێڵاوی کرد ، چۆن چوویتە سەر ئەو منارەیە بۆ جێبەجێ کردنی کارێك کە هەرگیز نایەتەدیو ناکرێت ، خۆزگە هەر لە باری دایکت بچوویتایە ، نەکوو ببیت بەو مرۆڤەو ئەم جیهـــانە پڕ زوڵمو زۆرداریـــەت بدیبایە ، خۆزگە چـــاوت بــــە تیشـــــکی ڕۆژ

هەڵنەهاتایە .. تۆلە کەناری دەریای ڕەش ماتو هێمنو گەورە بوویت ، لەگەڵ شمشاڵدا بوویتــە هاودەم ، ئەو شمشاڵەی کە تەنیا لە قامیش دروست دەکرێت ، بەڵام تۆی پاڵ پێوە نا بۆ ئازارو ئەشکەنجە ئەی هەزارە داماوەکە ] .

مەڕەکان هۆش‌و ئارامیان لێ هەڵدەگیرێت‌و بێ سێ‌و دوو یەك بە دوای یەکدا ملدەنێن‌و سەردەکەونە سەر پەیژەکەو ئەو ڕۆژەش بۆ نەگبەتی حەســۆو بەختانی ئاغا زەڵغ ئەتوت فریشتەو پەریی ئاسمان هاتوون ئارایشتیان کردووەو دەســتە خرپنەکانی بۆ حەسۆ درێژ دەکردو دەی ووت :ــ

( حەسۆ من بۆ تۆ دەبم
ئەگەر بە زیندوویی بمێنمەوە جگە لە تۆ کەسم ناوێت
ئەگەر مردیشم ئەوا لە خاکدا بەیەك دەگەین
تا مردن تۆم خۆش دەوێت ، دەتپەرستم
زیاتر لە پەرستنی مەجنوون بۆ لەیلای شۆخ
خۆشم دەوێیت
زیاتر لە خۆشەویستی پەپوولە بۆ ڕووناکی
شەیداتم، زیاتر لە شەیدا بوونی بولبول بۆ گوڵی گەش
حەسۆ گیان

خۆشەویستی من بۆ تۆ زۆر بەهێز ترە لــە خۆشەویستی دنیا بۆ خۆر ... مۆمی منیت ... مۆمی ژیانمیت .. گوڵە ڕەیحانەی زولفەکانی منیت .. تۆ ژیانمیت ، تۆ گیانمیت .. شیرینەکەم حەسۆ ) .

دوای بیستنی ئەم ووشانە حەسۆ مەســـت دەبێت ئیتر بزانە چۆن ئاوازێك دەربهێنێت ؟! بەرانە گەورەکە کە لە پێش ڕانەکەوە دەڕۆیشت‌و دەگاتە بەردەمی پلە شکاوەکە مردنی خۆی بە چاوی خۆی دەبینێت بەڵام وەك سەر خۆش هیچی بەلاوە گرنگ نابێت هەر مل دەنێت تا دەستەکانی دەخاتە سەر پلە شکاوەکەو پلەکە دەترازێت‌و سەرەو خوار دەبێتەوەو دەکەوێتە سەر زەویو پارچە پارچە دەبێت .

حەســـۆ هەڵ دەســتێت [ ئاخ ... مــەڕە هەزارەکەم .. چەندم خۆش ئەویستیت .. ] حەسۆ چەند دڵۆپە فرمێسك دەکاتە دیاری‌و سەیرێکی زەڵغی دەکات ئیتر بەرانەکەی لەبیر دەچێتەوە ، بە بێ هەست دەست دەکاتەوە شمشاڵ لێدان کاتێك مەڕەکان ئەم بەسەرهاتە دەبینن تۆزێك دەکشێنەوەو خەریك دەبن بە تەواوی بگەڕێنە دواوە بەڵام کاریگــەریی ئاوازە بە سۆزەکانی حەسۆ لە پەردەی گوێی دانەوە لــە

حزبی سەرکردە بە سەرکردایەتی کردنی هەڵمەتی گشتی نیشتمانی لە ناوبردنی نەخوێندەواری تیوری مرۆڤانەی خۆی خستە ڕوو .

هۆ هاونیشتمانی بەڕێز، بەشداری کردنت لە نەهێشتنی نەخوێندەواریدا بەڵگەی نیشتمان پەروەریتە .

پەیژەکە نزیك دەبنەوەو بەرانی دووهەم دێتەپێشەوە .. سەردەکەوێت تا دەگاتە پلە شکاوەکە. دەستەکانی بەرز دەکاتەوە .. دەیەوێت باز بدات بەڵام ناتوانێت‌و دەکەوێت‌و پارچە پارچە دەبێت .

(ئاخ .. هەزار ئاخ .. بەرانە خۆشەویستەکەم)

دیسانەوە بەسەیر کردنێکی زەڵغ هەموویانی لە بیر دەچێتەوەو دەست دەکاتەوە بە شمشاڵ لێدان ، بە ڕانێکی تر سەر دەکەوێت‌و تاڵاوی یەکەم‌و دووهەم بە قوڕگی ئەمیشدا دەچێت ، لەگەڵ ئەم هەمــــوو ناخۆشیو دەردی سەری‌و جەرگ بڕینەدا حەســـۆ هەر بەردەوام لەسەر کاری خۆی دەڕوات ، دەست دەکاتە قسەکردن بە ئاوازەوە :ــ

( بازدەن ... بازدەن
وەرنە پێشەوە
دەوەرن ... وەرنە لام خۆشەویستەکانم
هەمووتانم خۆش دەوێت
وەرن سەر کەون ، لە دەوری هاوڕێ وەفادارەکەتان
کۆببنەوە
کۆببنەوە خۆشەویستەکانم
وەرنە لامەوە ) .

ئیتر مــەڕەکان دونیایان لــە پێش چاو ڕەش

دەبێت ، بە تەواوی ترسیان لێ دنیشێتو دەگەڕێنە دواوە ، حەسۆ زۆری سەر سوڕ دەمێنێتو نهێنی‌ی گەڕانەوەی مەڕەکان نازانێتو هەست بەوە ناکات کە پلەبەکیان بە هونەرێکی وا دروست کراوە کە هەر قورسیبەکی بخرێتە سەر خۆی ڕا ناگرێتو دەترازێت چونکە ئەم وەك کوێر هیچی نەدەدی ، هەموو هەستو دڵو دەروونی دابووە شمشاڵەکەی، بەڵام سوودی چی‌یە ؟ !

ئەو ئاوازانەی دارو بەردی گریانو بێ گیانی هێنایە سەما هیچی بۆ ئەم نەکردو هەموو مەڕەکان کشانە دواوە ، کشانەوەی مەڕەکانو دەنگی بە سۆزی شمشاڵەکەی حەسۆ دنیابەکی وای دروست کردبوو کە ئاغا بەو بێ ویژدانی‌یەی خۆیەوە لە کرداری خۆی تەریق دەبێتەوەو کاتێك زەڵخ هەست بە سەرنەکەوتنی حەسۆ دەکات دنیا بە تەواوی لەبەر چاوی دەگۆڕێت ، لە دونیای بە هیواو رووناکو دەست لە مل کردنەوە دچێتە دونیای ڕەش بینیو لێك جیا بوونەوە ، خەریك دەبێت لێك ببێتەوە بەڵام رۆح لە جێگایەکی سەختدایەو دەرنایەت .

حەسۆ ئاواز بە ئاوازی دەگۆڕی . بە هەموو تواناو سەلیقەیەکەوە فووی بە شمشاڵەکەیدا دەکرد تا بە تەواوی شەکەت دەبێت ئیتر توانای نامێنێت .

هەموو دلێك ، گەورە ، بچوك ، دارو بەرد ، گشت کش‌و مات دەبن ، پەردەیەکی سامناك بەسەر ئەو ناوەدا دەکشێت ، ئیتر حەسۆ بە فێلەکە دمزانێتو هیوای نامێنێتو بێ دەنگ دەبێت ، چاودکانی سوور دەبن‌و ئەفرەتو بەزەیی‌و دڵ شکاوی‌و تۆڵەی لێ دەتکا ، بۆی دەردەکەوێت کە هێنانی زەڵخ بۆ سەربانەکە لەبەر ئەوە بووە کە حەسۆ چاوی هیچ نەبینێتو هەر سەیری زەڵخ بکات ، (زەڵخ) یش لە جێگای خۆی‌دا ڕەق د.بێتو سەرنجی باوکی تاوانباری دەداتو ڕق‌و بەزەیی لە چاو دەتکێت ، دوایی‌بە لای حەسۆدا لادەکاتەوەو چاوەکانی فرمێسکی خوێنینی دەڕێژن ، ووردە .. ووردە هەموو شتێك بێ دەنگ دەبێت ، پاش ماوەیەکی کەم گوێیان لەدوو هاوار دەبێت ، هەر یەکەیان لە جێگای خۆیەوە بەردەداتە خوارەوە بۆ ناو بەردەڵانەکان ، کاتێك خەڵکە بەدەم هاوارەکانەوە دەچن چی دەبینن ؟ ! لاشەی حەسۆو زەڵخ دەبینن تێك شکاوو دەستیان لە گەردنو ملی یەکتردایە .

◁

## چیرۆك
# تەپە

دوێنێ شەو لە گرمەی دانیشتنەکەدا : نمی فرمێسك لە چاوی ئەفەندی‌یە پایەدارەکەدا قەتیس مابور ، خەم وەکو هەڵم لە نیگای چاوی ڕاستی‌وە دەکشا بەرەو نیگای چاوی چەپی ، ناوچەوانی بروسکەی ئەدا :

بروسکەیەکی بێ دەسەڵات کەوەك نیشەکی چروك ددنگی هەبوو، ڕەنگی نەبوو ....

ئاوا بەم چەشنە ئەفەندی‌یە بەپەرۆشەکە مل‌ملانی ئەکرد لەگەڵ لەشکری زەبرا .... لەشکری زەبر دەستکردی خەیاڵێکی نیمچە ڕەنگینی خۆی بور ، زۆر سەیر لە قوڵایی دەروونیا داگیرسابوو : ئەتووت جەرگی لالەیە لە چیمەنە نەرم‌و نۆڵەکەدا ، قاش قاش کراوەو بۆکرۆزی جوانەمەرگی لێ هەڵئەستێ !

**برادەرانی مەجلیسەکەی ئەفەندی: کزو ماتو مەلول بوون : نەیانئەزانی چۆن دڵی ئەفەندی‌یە بەتاسوقەکەی هاورێیان بدەنەوە .... تا مەجلیسیش چۆڵبوو : ماتی‌یەکی هاوبەشی سەرو سیمای گرتبوونەوە ... بەڵام ئەم ( خەم ـ پۆشی‌یەی ) ئەمان زۆرتر بۆ ڕووالەت بوو ، خەمێکی تەنك بوو ، تا نیوەی ڕێگاش بڕی نەکرد ... دادێکی ئەو کلولەی هاورێیانی ئەدا .. دنیاکەش پڕبوو لە کێشمەکێش‌و سەر ئێشە : بەکورتی خەمی خۆ ئەوەندە زۆر بوو، خەمی ئەمو ئەوی لوول‌ئەداو لەناویا ئەم غەیرە خەمانە دەتوانەوە ...**

خەمی ئەفەندی خەمێکی تایبەتی‌و

# دووکەڵێکی زەردباو

ف.أ.

خنجیلانەو لەرزۆك بوو ، تا ڕادەیەك ئێسكی سووكبوو : خەمێ بوو ئەگەرچی بەری كەفچرینی شەپۆلێكی بێ‌وادە بوو ، بەڵام ئەگەر بەرەچەلەكیا بچویتایە خوارێ لەوانەبوو سەمەرەو سۆزی مرۆڤایەتی‌یەكی بەئەندێشەی بەدوواوە بووایە ... زۆرتر لەو خەمو سۆزشە ئەچوو كە خەڵكو خوا بۆ دنیای فانی‌و دووڕوویی سفرەو خوانەكانی ئەی جوونو ئەیخۆنەوە ... بەڵام بێهوودە !

★ ★ ★

... بەیانی كە گزنگی خۆر سەرلوتكەكانی ختە بزەو لەرزە ، یەكەم هەنگاوی ( پاڵەوانەكەمان ) ریش تاشینێكی نابەدڵ بوو ، لەپاشانیشا جلو بەرگ گۆڕینێكی نابەدڵتر بوو ! .

لەچەپی ڕێكاكەی شەقامە گەورەكەدا ، لووتی بوو بە لووتی سوالكەرە منالەكەی كۆنە ئاشنای گەڕەكی خۆیانەوە ، خەمە بەرینەكەی ئەفەندی لەوانە نەبوو ئەم خەمە بچكۆلە سادەیە بگرێتە خۆ ، بۆیە بە ساردی‌یەكەوە چاوی كەمتەرخەمی‌و خۆگێل‌لێ‌كردنی لێ داگرتو خێرا پێ‌ی‌نا بە دوگمەی خێرایی‌داو وەك تیر لەكەوان بۆی دەرچوو ! .

دیمەنی دووەم ژنێكی قەیرە بوو ، منالێكی نەخۆشی بەدەستەوەبوو وەك بەچاو لەخەڵكەكە بپاڕێتەوە چارێ بۆ منالە بیمارەكەی بلۆزنەوە وابوو .. زۆر سەیر لەناو عەشاماتەكەی دەورو پشتی‌دا ئەی‌نوواند ، ئەتووت دەوارێكی ڕەشە بەلایەكدا لاربۆتەوە.. ئەمیش لە ڕۆتینە بێزراوەكانی ژیانی ڕۆژانە بوو ، بۆیە ئەفەندی‌یە ـ بەپەرۆشەكەی كەم‌و زۆر نەجوڵان !

★ ★ ★

**له خەراباتەكەی‌لای ڕاستی سەربازگەكەوە ، دیمەنێكی نوێ هەڵهات : كە نزیك بۆوە ، ئەمجارە ئەفەندی زۆر بەچاوێكی(عەطوفەوە) تا توانی سەرنجی‌دا ، وا دیاربوو لە فیلیمێكدا یان لە گۆڤارێكی ڕەنگاو ڕەنگا (شەبیهی) ئەو دیمەنەی‌دیبوو! فژی لاوێكی بەدی‌كرد پەخش بوو بۆوە بەسەر ملو گەردنە لاربۆكەیدا، چاوی خەواڵوی وەك تازە وەنەوزی سەفەرێكی دووری دابێ‌و لەپڕ لە خەو خەبەریان كردبێتەوەو هێشتا وەكو خەو بەری نەدابێ وابوو ... شەش ـ حەوت كەس لەپشت تەختە بەندەكەیەوە هێواش هێواش ئەیڕۆیشتن ... سەیرە لەو وڵاتانە نوستوو مردوو وەك یەك دەنوێنن ! ئەمامەكە وەك دەرئەكەوت بە بروسكەیەكی ناوەخت لار بوو بۆوە ! لەڕادیۆ كەی بەردەمی‌یەوە : گۆرانی بێژەكە لاوكێكی سەیری گرتبوو بەدەمی‌یەوە :**

**« ... بەیانی‌یەكی زوو ، لە حەوشەیەكی خامۆش‌و تەنگەبەردا .. ڕەورەوەیەكی گەڕۆك ، قولاپێكی ڕەش‌و ئێسك گران ، شەش ـ حەوت بەتەوان ڕەوانیان لە دنیای بوونەوە برد بۆ دنیای نەبوون .. ! »**

★ ★ ★

ئەمانە هەمووی وەك كاروانێكی دیمەنی شكستە ، بەبیری ئەفەندی‌یە خەمخوارەكەدا زۆر گورج تێ‌پەڕی ، لەگەڵ دوور كەوتنەوەی تەختە بەندەكەدا : بیرەوەرێكەی ئەمیش كوژایەوە ...

دنیایەكی بێ‌وەفاو شپرزە ... وەك دەڵێن ژیان تیایدالای مەرگ هەمیشە قەرزە ! پێ‌ی نا بە دوگمەی فیشقە زەردە ئاگر پژێنەكەدا ، دیمەنەكە لەچاو ئاوابوو ...

★ ★ ★

ئیتر لەوە ئەچوو لافاوی بێ‌وادەی ئەم هەموو خەمەی ئەفەندی وورده وورده بەرەو كزبوون بچێت ، بگرە ئەوەندەی نەماوو بزە هەردوو لێوی تەڕبكاتەوە ... بەڵام كە لەكەناری شەقامە گەورەكەدا بەژنی كیژۆلەیەكی سفت پووزی ، سینەو بەرۆك بەرزی بەدی‌كرد چزووی ناسۆرەكەی دوێشەو ، وەك دەرزی ئاژنی دەروونی بكات : ئەندامەكانی هەموو هێنایەوە لەرزە ، قریوەیەكی ئارەزوو لە زاری دەرچوو ، فرمێسك سەر لەنوێ ڕژایەوە چاوی ڕاستی‌و لەپاشانا نمی كردە چاوی چەپی ، بەدەم وورتەو هاوارێكی هەرزەكارێوە ئەكرووزایەوەو لەبەر خۆیەوە ئەی ووت « ئاخ خوزگە ئیمشەو بۆ چارەكە سەعاتێكیش ریككەوتایە لەباوەشما بوایە » ....

★ ★ ★

بەغدا

١٢-١٢-١٩٧٨

# تەجروبەی من و شیعر

د. عزالدين مصطفى رسول

[ئەم باسە لە دوو کۆڕی یەکێتی‌ی نووسەرانی کورددا پێشکەش کرا ، یەکەمیان ئێوارەی ڕۆژی دووشەممە لە مەڵبەندی گشتی‌ی یەکێتی لە بەغداو دووەمیان بەیانی‌ی ١٥ـ١١ـ١٩٧٨! لە سلێمانی ، ئەمەی خوارەوە هەر کەرەسەی ئەو دوو کۆڕەیە بە دەستکاری‌یەوە ، کە ووتاری خوێندراوە بخاتە قالبی چاپکردنەوە . ]

**نووسەر**

کە لیژنەی ڕۆشنبیری یەکێتی‌ی نووسەرانی کورد بەرنامەی وەرزی تازەیان پێ ڕاگەیاندم ، بەندی یەکەمی ئەو بەرنامەیەم بەدڵ نەبوو ، واتە ـ نەمئەویست یەکەم ناوو یەکەم قسەکەری ئەم وەرزەبم ، ویستم پێیان بگۆڕم . دەبێ نەیشارمەوە کە هۆی یەکەمی ئەم نارەزایی‌یە بەستنی ناوی یەکەم قسەکەر بوو بە ئەرکو ناوی سەرۆکی یەکێتی‌ی نووسەرانی کوردەوە. چونکە ئەم یەکخستنی ناوە ، تابلۆی ناوەڕۆکی باس‌و موحازەرەو ڕێبازی تازەی یەکێتی لای زۆر کەس‌و زۆر لا یەکدەخات ،کە ڕاستتر لە یەک جیاکردنەوەیانەو کەسێك کە دەمێکە لە کۆڕی بەرهەمی ئەدەبی‌و ڕەخنەو ڕۆژنامەگەریدا لە گەڵتانا بووە ، بەرهەم‌و باسی ئێستاشی هەر بەری ئەو ڕێڕەودو کۆششێکی تازەی ئەو پەیڕەوەیە کە دەیزانن‌و بە شتێکی‌ترو کەسێکی‌ترو باری تازەی ئەم مەڵبەندەوە نابەسترێ .

ئەم سەرەتایە پێویست‌بوو ، هەر بۆ ئەوەش پێویست‌بوو کە بڵێم : کاتێك کە لیژنەی ڕۆشنبیری سووربوون لە سەر بڕیارەکەیان : ڕیزە ناوو باسێك هاتنە بەردەمم ، بەڵام خۆشم ناوی باسم لە باری یەکەم وەرزی تازەی یەکێتی‌ی نووسەران جیانەکردەوە ، لەبەر ئەوە لاپەڕەم بە سەر چەند ئامادەکراوو نیوە ئامادەکراوی پێنازکەوتووی ، چاپنەکراودا هەڵدایەوە ، لە ناوی تاقە شاعیرو تاقە نووسەر یان هەندێك ڕێبازی تایبەتی‌ی بەرهەمی ئەدەبی دوورکەوتمەوەو بە ناچاری هاتمەوە ناو چوارچێوەیەکی گشتی‌یەوەو شیعرم هەڵبژارد .

بە سەرپێوە ناوەڕۆکی باسم لە ڕەئووف حەسەن‌و لەتیف هەڵمەت گەیاندو ئەوان جارێك « من‌و شیعر »و جارێك «تەجروبەی من‌و شیعر»یان کرد بە ناونیشانی

ئەم باسەی ئەمڕۆو بەکەرەسەی خوانی ئەم دیدەنی‌یە تازەیە . ڕەنگە لاتان سەیربێت ، کەسێك بە شاعیرتان نەناسیوە ، باسی خۆی‌و شیعر بکات ، یان تەجروبەی خۆی‌و شیعرتان بۆ بگێڕێتەوە .

سەرتان سووڕنەمێنێ ، چونکە زۆربەی میوان‌و خاوەن ماڵانی مەڵبەندی ئەدەبیـــات لە شیعرەوە دەستیان پێکردووە . جا لای هەندێکیان هەر نیشانەی دەست‌پێکردن‌و سەرەتای هەڵسوکەوتی ووشەکاری بووەو لای هەندێکیان بناغەو تۆوی یەکەم ڕێبازگرتن‌و گەشەسەندن‌و بوونە شاعیر بووەو لای هەندێکیش هەربەشێك بووە ، تەنانەت بەشێکی بچووك بووە لە هۆی دەربڕین‌و جاروبار لە پاڵ ئـــەو بەرهەمـــــە سەرەکی‌یەدا کە خەریکی بووەو پێی ناسراوە . لـــە ناخی دەروونەوە ، هەستی پەنگـــەوە خواردوو و تەجروبەی تازە بووە بە لێشاوی شیعرو تەقیوەتەوەو دەربەڕیوە ، یان بڵێین لە سەرکاغەز خۆی نوواندووە . بۆیە سەیر نی‌یە کە ڤیکتۆر هێگۆ هێندەی نووسەرە هێندەش شاعیر بێت‌و گۆرکی ڕازی دڵی زۆرجار بە شیعر دەربڕیبێ‌و هەندێك جار لە دەروونی زانایان‌و ڕابەرانی سیاسی‌ی ووڵاتان‌و جیهاندا ، کێشـــەو ئەندیشەی ژیان بە چەند دێڕو چەنـــد هۆنراوەی ناسك خۆیان دەربڕن . ئەمەش سەرەتایەکی تر بوو، ئەمەش هەر پێشەکی‌و بناغەی مەبەس نی‌یە .

بەڵێ : چەند لاپەڕەیەکی کورت دەربارەی ئەو چەنـــد پارچـــە شیعرەی لـــە چاپکراوی « ڕازی دووری»دا خوێنـــدووتانەوە ، دەربارەی چەنـــــد پارچەیەکی تر کە دەچنە سەر ئەوان دەنووسرێت ، هەموو ئەوانەش هەستی قووڵی ، پڕ لە ئازاری ، دوورو ووڵاتی‌ی کەسێکن کە لەو سەردەمەدا دڵی لە گەڵ هەمـــوو کارو ڕووداوی ڕۆژانەی ووڵاتـــــدا لێی‌داوەو ئەو هەستـــە لە گەڵ ئەم هەواڵو ئـــەو هەواڵ ، لە گەڵ مەرگی خۆشەویستان‌و کۆچـــی دڵداران‌و تراجیدیای شەهیدانا بووە بە شیعرو لە جێی فرمێسك ، خاوەن بەرهەمی ئاسوودە کردووەو کڵپەی دەروونی‌ی دامرکاندۆتەوەو فێنکی‌ی داوە بە دڵی . لەبەر ئەوە لای خاوەنی ، هـــۆی دەربڕینن . ئەگەر لای ڕەخنەگران بە شیعریش دانەنرێن ، یان لە ڕیزو پلەی شیعری کوردیدا لە خانەیەکی نزمیشـــدا دانەنرێن ، ئەوا لە ڕووی تەجروبەی شیعری‌یەوە هەر یەکە لێرەدا ڕەنگە وەك کـــەسێك کـــە خەریکـــی

ڕەخنەگری یان ڕەخنەنووسین بووە مافی ئـــــەوەم نەدەنێ کە ئەو پارچە شیعرانە هەڵسەنگێنم‌و لـــــە خانەی شـــیعری کوردیـــــدا جێگەی خۆیان بـــۆ دەست‌نیشان‌بکەم‌و لە « وێنەو مۆسیقاو زمان » یان بدوێم . بەلام لە ڕووی تەجروبەی شیعرەوە ئێوەش ڕێگەم دەدەنێ لێیان‌بدوێم‌و خۆشم بۆم هەیە لـــــە مەیدانی یادداشت‌نووسینەوەدا لە چیرۆکی هەر دێڕە پارچە شیعرە بدوێم .

لێرەدا ناتوانم بە درێژی لەوەش بدوێم : بەلام هەر ئەو تەجروبەیە سەرناوێکی تازە دەبەخشێ ، کە دەبێ بۆ ژیان‌و ووردی لە بەرهەم گەیشـــــتنی شاعیرانمان دوای بکەوین .

.. چۆن شاعیر — شیعر دەنووسێت ؟ .. چی دەربارەی لەدایك‌بوون‌و ڕەشنووس‌و پاکنووســـی مەم‌و زینی خانی‌و شیرین‌و خەسرەوی خانای قوبادی‌و شێخی سەنعانی ئەفێی تەیران دەزانین ؟ .

ڤیکتۆر هێگۆ کوڕێکی دەمرێ ، زۆر کـــاری تێ‌دەکات ، بەلام ئەو پاش بیست ساڵ شینی بـــۆ دەکات‌و شـــیعری بـــۆ دەهۆنێتـــــەوە . دیارە فەرەنسایەکان لە زۆر ڕووەوە لەم پارچەیەو لـــەو دیاردەیە دوواون . بەلام ئێمە تا ئێستـــا نازانین — ژان‌و ژێ‌و جووڵان‌و هەژاندنی مەولەوی بە دەست شینی عەنبەر خاتوونەوە چۆن بووە ؟ ئەحمەد بەگی کۆماسی کەی « گلکۆی تازەی لەیل »ی نووســـــی « ئەگەر ئەو نووسیبێتی‌و شیعری حەماغا نەبێت ؟ »، یان حەماغای دەربەندفەقەرە پاش چەنـــــد « بازم تەوارەن »ی ووت ، تەنانەت هیچ بەڵگەیەکمـــــــان دەرباری « شینی گوڵاڵە »ی گۆرانیش بـــە دەستەوە نی‌یەو نازانین ئازاری مـــەرگی «دارا» بۆ لای هەردی نەبوو بە شیعر .

لەبەر ئەوە سەرتان سووڕنەمێنێ ، کەسێك بە شاعیرتان نەناسیبووە ، ڕۆژێك لە ڕۆژان دەرفەتی بێ تەجروبـــەی قووڵی ، ڕاستەقینەی ، تەقینەوەی ئازارو ئەشکی مەرگی ئـــەو هـــاوڕێ‌و کـــەس‌و خۆشەویستانەی بوونە سەرناوی پارچەکانی « ڕازی دووری »و ئەوانیترتان بۆ بنووسێت ، هەمووشـــی تەجروبەی «ژان‌و ژێ»ی ڕاستەقینەن لە گـــــەڵ شیعرداو سەرەتاو هۆی بەرهەمێکن لە بەر دەستدان منداڵن ، «جگەرگۆشـــەی شـــیعرن» ، با جوان‌و چاوکاڵ‌و بالا بەرزو شۆخ‌و داناش نەبن .

لە پاشا : شیللەر حەزی دەکرد لە کاتی شیعر نووسیندا بۆنی ئەو سێوە گەنیوە بکات کە لە چاوی مێزەکەیدا شاردبوویەوە ، شاعیرێك وابزانم لامارتینە قاچی دەخستە ناو ئاودوەو شیعری دەنووسی . شاعیری واش هەیە بەدەم چا یان قاوە خواردنەوە یان جگەرەکێشانەوە شیعر دەنووسن .

جەواهیری بە دوو چەشنی سەیر شیعر دنووسێ . لە مۆزەخانەی پووشکین‌و لێرمانتۆفدا رەشنووسی زۆر لە بەرهەمەکانیان پارێزراون . یەکێکیان پارچەکانی لەسەر کاغەز لەدایكدەبن ، واتە رەشنووسەکە کوژاندنەوەی زۆر پێوە دیارە ، تەنانەت هەندێ رەسمیشی تەواو دبوو ، ئەوسا دەچووە سەر کاغەز ، واتە کوژاندنەوە بە رەشنووسەکانی‌یەوە نابینی .

ئەمانەش سەرناوی یادداشت‌و تەجروبەی شیعرین ، بەلام ئێمە هێشتا کەممان نووسیوەتەوە ، رەشنووسمان بەدەگمەن هەلگرتووە ، یەك دەستنووسی نالی یان حاجی خۆیانمان نەماوە ، قەلەندەرخانەکەی پیرەمێردو شوێن چاپخانەی حوزنی‌و گیوی موکریانیمان تێكداو خانووی ئەمین زەکی‌و تۆفیق وەهبیمان لە کیس دا .

ئەو رەشنووس‌و جێگایانە هەر بەلگەی مێژوویی‌و نموونەی یادگارو بابەتی مۆزەخانەنین ، بەلکو کلیلێکی ترن بۆ رەخنەگر ، زۆرجار پەنجەرەی لێکدانەوەی سایکۆلۆژیی بەرهەمن ، رێگەی شارەزابوونی هاتنەوە ژێ «تۆتر»و جوولانی ناخی شاعیرن . هۆیەکی ترن لە هۆکانی بە قوولی لە بەرهەم گەیشتن‌و شاعیر ناسین‌و کەردسەی زیندووی دوور لە بەرهەمن بەدەست شاعیرەوە .

لەم رووەشەوە سەرناوێکی تری « من‌و شیعر» یان «تەجروبەی من‌و شیعر»دێتە کایەوە ، کە ئەمەیان تەواو لە سنووری خۆو چەند پارچەیەکی بە شیعر زانراو یان نەزانراومان دەباتە دەرەوە ، بەرەو ئاسۆیەکی بەرین‌و فراوانمان دەبات کە ئاسۆی شیعری سەردەمەو هیچ نەبێ بەری ناسین‌و دنیا دیدەیی‌و تەمەنێکی پان‌و بەرین‌و پڕ لە رووداوو دیاردەو کەسان‌و شاعیران ناسینە .

وەك وتم : خۆم بە شاعیر نازانم ، لە بەر ئەوە ناگونجێ یەکەم کەس بم دەست بدەمە قەلەم‌و تەجروبەی ژان‌و ژێ‌و دەربەرینی هەریەکە لەو پارچانە بنووسم ، کە لە گەل هەریەکەدا تەجروبەیەکی راستەقینەو هەژاندنێکی قوول‌و تێکەلبوونێکی‌عاتیفەو رووداوو کەرەسەی گردەوە بووی زمان‌و وێنەو داستانی کۆنم دیوە .

هەر ئەوەش کلاورۆژنەی تەجروبەی راستەقینەی شیعر بینینمە ، بەو جۆرە راستگۆیی شاعیران تاقی دەکەمەوە ، شیعری بێ هەژاندن‌و ژان‌و ژی‌و تەجروبەیەکی راستەقینە ، بۆنو بۆکرووزو هالاوی دلی گەرم‌و سۆزی دلسۆزی‌و شیرینی‌ی راستی‌و راستگۆیی تێدا نابینرێ ، با بەری سنعەتکاری‌و دەسەلاتێکی باشیش بێت بە سەر کێش‌و قافیەدا . رەنگە بپرسن کە کۆمەلە شیعرێك لەو دەروونەوە هەلقولیبن‌و بورکانی تەقیوەی دلێکی پڕ لە ئازاربن، چۆن ناچنە ریزی پێشەوەی شیعرەوە، یان هیچ نەبێ ناچنە ریزی پێشەوەی شیعری کوردی‌یەوە .

لێرەدا هەلویستی رەخنەگرانە رادەبەرێ‌و دەووترێ : ئەوەیە توانای هێزی شاعیر ، ئەوەیە جیاوازی ئەم شاعیرو ئەو شاعیرو دەسەلات بە سەر کەردسەدا « کە زمان‌و ووشەو وێنەو بابەت‌و روخسارو مۆسیقاو زۆرو کەمی‌و فراوانی‌ی بەنگەوەخواردووی بەکارنەهێنراوی ئەمانەش دەگرێتەوە » .

شاعیر ئینسانە ، دەجوولێ ، دەگری ، پێ‌دەکەنێ ، هەندێك جاریش هەموو ئەمانە دبن بە شیعر ، بەلام جوولاندنەکە لە گەل کەردسەو دەسەلاتەکەدا تێکەل دەبن‌و لەو پلەیەی شاعیر خۆیدا، یان هەر لە پلەی پارچەکەدا دەردەبەرن‌و وێنەیەکی پەیکەرداری ئامێتەیی «باس»و «خۆ»[موضوع‌و ذات] پیشاندەدەن .

هەندێك نموونەتان دەوێت ، وەك ووترا : با ئەم قسانە شاعیرە ناسراوە ، تەجروبە بە پیتەکانمان بخەنە کارو تەجروبەی خۆیان بگێرنەوە ، لاشتان گران نەبێت کە هەندێك نموونە لە کەسێکەوە ببیستن کە هەژان‌و تەجروبەی ـ وێنەی راستگۆو راستەقینەی دەربەرینی شاعیرانەیە ، بەلام رەنگە کەرەسەو دەسەلاتی بەسەر کەرەسەکەدا ئەوە نەبێت کە بیباتە مەجلیسی شاعیران :

نموونە :

وەك لەو شیعرانەدا دەبینن زۆربەی یان هەمووی

له دەرەوەی وڵات ووتراون : له سێ ساڵی ١٩٦٣ بۆ ١٩٦٥ نووسراون . پاش ئەوه له کاتی دوو ئاسۆری دڵدا پارچەی بچووکی تریان لێره چۆته سەر .

ساڵی ١٩٧٦ ـ ١٩٧٧ی خوێندن له مۆسکۆ بووم . زادەی ئەو ساڵەش لـه شیعر ، دوو پارچەو چەنـــد دێڕی تاك تاكەو هەر دووبارەبوونـــەوەی تەجروبـــەی ژانو ژێی دەروونن لـــه گـــەڵ مـــەرگی ئازیزاندا .

ڕۆژێك به لای ئێستکەی « نۆڤەساله‌بۆدسکایا » ی میترۆی ژێرزەمیندا ڕابوردم. خورپەی دڵو شەقامی دووری یادگارو هاتنەوەبیرو فرمێسکی چـاو پێکەوه هاوڕێو برا ومامۆستایەکی وێنەتاکـــی ژیانمـــی بیرخستمەوه که ساڵی ١٩٦٢ دواجار لەبەر دەرگای ئەو ئێستکەیەدا ماڵئاوایی لێکردمو هاتمەوه وڵاتو ئیتر نەمدیوه .

نه وێنەی ئەو نه پەستیو ماتەم له نیوەڕۆوه تا شەو بەریان ـ نەدام ، خەویان لێحەرامکردم . له سەعات چواری بەرەبەیاندا پارچەیه چووه سەرکاغەز که له ڕۆژنامەی « بیری نوێ »دا به ناوی « شیء من الوجد »ەوه بڵاوکرایەوه . کاغەزم داناو یەکسەر تا چێشتەنگاو نووستم .

ڕەنگه بپرسن بۆچ به عەرەبی ، منیش ئەو کاتـــه دەمپرسی بۆچ به عەرەبی ؟

ساڵی ٩١٥١ ـ ١٩٥٢ کۆمەڵه چیرۆکێکم بـــه عەرەبی نووسیبوو ، وونبوون ، سووتان ... ڕەنگه بڵێن باشتر ، سەیریشه که هەر ئەو ساڵه لـــه بەندیخانەی بەغدا براینه لای ئەو مامۆستایەم . پاش دووانو قسەو موناقەشەیەکی زۆر دەرسێکی گەورەی ژیانی دامێ !

کاری ئیبداعی بـــه کوردی بنووسمو هەر بـــه کوردی ، بەڵام عەرەبی زانینەکه بۆ سوودی کورد به کاربێنم ، لەسەر کورد بنووسم ، شـیعری کوردیی وەرگێڕراو به عەرەب بناسێنم .

که واته بۆچ له هەژانێکدا که مەرگی ئـــەوو یادی ئەو چاوگی به شیعر دەربەڕێنێ تەجروبەی بێت ئەو پارچەیه له خۆیەوه به عەرەبی نووسرا ؟ .

وەك ووتم : ئەگەر وەك خاوەن تەجروبـــه لێمبپرسن ، منیش دەڵێم بۆچ ؟ بەڵام ئێستا لـــه هەڵویستی لێکۆڵینەوەو ڕەخنەوه دەتوانم بڵێم : کەرەسەی پەنگـەوەخواردووی زمان ، لای مـــن ، دەفینەو شارراوەی عـــەرەبیو کوردیی هاوچوونو هاوسانن . لەو ڕۆژانەدا هەموو ڕۆژ له گەڵ برایەکی سۆڤێتیی شارەزای عەرەبیو تەسەوفدا دائەنیشتین، یارمەتیی بەڕووسی وەرگێڕانی کتێبی «خانی»یەکەی دام . هەر لەبـــەر ئەوه کتێبەکـــه عەردبی بوو ، سەرچاوەی تەسەووفو ئیستیلاحی عەرەبین . ئەو پارچه هۆنراوەیەش خۆی پڕه له ئیستیلاحو وێنەو بیری سۆفیانەو دیمەنی به ئازارەوه کوشتنی حەللاجو وێنەی بەداراکردنی دووباره بۆتەوه ، هەر لەبەر ئەوه پارچەکه که کونجی گەنجه شارراوه، پەنگەوەخواردووه عەرەبییەکەی ووشەو زمانەوه دەرپەڕی . ئەو لەگەڵ سۆفیزمو شیعری سۆفیو بیرو وێنەی تەسەوفدا ژیانه بەو جۆره ددرپەڕی .

عەبدوڵڵا پەشێوی شاعیر هەر پاش خوێندنەوەی ئەو چەند پارچەیه تێبینییەکی ووردی دامێ ، کـــه وا بزانم خۆشم دەرکم پێکردبوو : تو تەنیا لـــه دوورەوەی وڵات بۆ شیعر دەجوولێیتو تاسـەی دووری به شیعر دەردەبڕیت .

ڕاست دەکات . ئەمەش بەڵگەی ڕاستەقینەیی تەجربەکەیەو ئەگەر ئەوه چیرۆکی ئەو پارچه عەرەبییه بێت ، هەموو پارچەکانی تر « که هەموویان کوردین »، چیرۆکی خۆیان هـــەیـــەو هەندێك ڕەشنووسیشیان ماون . بەڵام وەك ووتم : ئەمه تەنیا بۆ هاندانـــی شاعیرەکانمانه ، حەزم دەکرد شاعیر بوومایه ، ئەگەر خاوەنی سێ موڵكو دیوانیش نەبوومایه ، خاوەنی موڵکێكو دیوانێکی بچووك بوومایـــه تا هـــەموو تەجروبەکەتان بۆ بگێڕمەوه .

بەڵام با چاوەڕێی شاعیرەکانمان بین ، چونکه خۆم به شایانی نووسینەوەی ئەو تەجروبەیەو تەنانەت یادداشت نووسینەوەش نابینم ، چونکه بێگومانـین لەوەی یادداشت نووسینەوه ، کاری ئەو کەسانەیه که کۆڵەکەی ڕووداوی مەزنی مێژووی جیهان یـــان وڵاتی خۆیانو گەلو نەتەوەی خۆیان بوون . یان ئەرکی ئەو نووسەرو شاعیره گەورانەیه که تەجروبەی بەرهەمو ژیانیـــان وەك بەرهەمەکـــه شایانـــی نووسینەوەیەو خۆی له خۆیدا بەری تـــەڕو پاراوو بەتام به گەلو مێژوو دەبەخشێ .

دەبوو ئەم ڕاستییه لـــەدەم لـــه یادداشت نووسیندانو له یادگار نووسینەوەمان دوورخاتەوه . بەڵام بەهرەی بیری تیژو چـــڕو پڕیـــی ئاگاداریو

پێوەندی بوونی دوورو نزیك بە زۆر ڕووداوو شاعیرو بەرهەمی ئەدەبی‌یەوە ، لە باری نەبوونی‌ی نەتەوەیەکی وەك ئێمەدا ئەرکی شایەتی‌دان‌و نووسینەوەی هەندێك شت دەخەنە سەرشانی گەلێك کەسی وەك ئێمە :

بازاڕی دەهرە قیمەتی ئەشیا بـە جێگەبـــە
مێشێ گەیشتە ڕووی نیگارێ لە خاك ئەچێ

لە منداڵی‌یەوە گوێم بە شیعر زرنگایەوە . زۆر کەس باسی یەکەم مامۆستایان دەکەن . بەڵێ ــ ئەوەی ئەلفو بێ‌ی فێر کردم ، شـــیعری دەووت یان هەر شاعیربوو . زۆر منداڵبووم ، وابزانـــم پێوەندی‌و نزیکی نەبوایە ، هێشتا کاتی ئەوەم نەهاتبوو ، کە دۆشەکەلەیەك‌و برێ داری سۆپا هەلگرم‌و بچمـــە حوجرە ، بەڵام وابوو زوو چوومە حوجرەی مەلا حامیدی کوڕی مەلا حەمدوونی شاعیری کوێر .

باوکـم لە حەمـــدوونـــەوە چێژی شیعری وەرگرتبوو ، بەڵام من زۆر درەنگ زانیم مامۆستام شاعیرە . بەڵێ لە نەورۆزدا بە ڕەنگی سوورو زەردو سەوزو شین نەورۆزنامەی فارسی‌ی بۆ نووسینەوەو پێ‌ی لەبەرکردین ، بەڵام من ئەو کاتە زانیم خـــۆی شاعیرە ، کە گەیشتبوومە پۆلی سێ‌یەمی ناوەندی‌و لە گەڵ هاوەڵەکانمدا لە سلێمانی بۆ یەکێك لـــە خۆپیشاندانەکانی ڕاپەڕینی کانوونی ســـالی ١٩٤٨ دەچووین . ئەو ڕاپەڕینە ئەو مامۆستا ، تەریکە ، دوورە خەلکەشی جووڵاندبوو ــ پارچە هۆنراوێکـی دامێ بیخوێنمەوە ، سەردێڕی ئەمە بوو :

خائین بـــەوەتـــەن سواری کـــەری کـــەن
بۆی لێ‌دەن لە چەپلە بەرەو دووا شار بە دەری
کەن

هەر ڕاپەڕینی کانوون‌و شیعری کـــوردی ــ بـــۆ زۆرکەس سەرباسن ، بەڵام بۆ من ــ سەرباسی گەلێك یادگارو کەرەسەی ڕەخنەیە ،

لەو سەرەتایەوە لە پاڵ حوجرەکەدا ئەومزگەوتە بوو کە باوکم مەلای‌بوو . کۆڕی مەلایان‌و شاعیران‌و ئەدەبیات‌و بەلاغەت دۆستان‌و منداڵێکی حەز بە لە شت‌گەیشتن‌و شت زانین دەبێ چیتان بۆ بگێڕێتەوە :

دیـــان زۆر منـــداڵ بووم بێکەس‌و بەختیـــار زێوەرم دی . بە دیار سوراحی‌یە ئاوێکەوە کـــە ماسی‌یەکی سووری تێدابوو ، لە نەخۆشخانەی لوبنان « سەفوەت » شیعری بۆ ووتبوو ، لە گەڵ خۆیدا بەو ڕێکە دوورەی ئەو سادا هێنابوویەوە . بێکەس تێ‌ی دەڕوانی‌و لەو دوو پارچـــە هۆنراوە نیشتمانی‌یەی « سەفوەت » دەدوا کە لە گەلاوێژدا بلاوکرابوونەوەو لەگەڵ پارچەیەکی تازەی « بێخود » دا بەراوردی دەکردن ، کە بەلای بێکەسەوە بە زۆر خۆی بەسەر شیعری نیشتمانپەروەریدا سەپاندبوو . بێکەس لای ئەم نیو دێڕە دەوەبستا کە دەڵێ « وەك کاکی خۆت فیدایی وەتەن » و دەیووت : ئەمە مەگەر گـــوێ‌ی لێ‌ببەستیتەوە ئەوسا لە شیعری نیشتمانی بچێت .

بەڵێ : بێخود ، ناوی شاعیری لاهوتی‌ی لـــە ڕەفیق حیلمی‌یەوە درابوویەو ڕاستیش هەر ئەوەیە کە هونەرمەندی ئەو مەیدانەی شیعرە .

ئێستاکە تاڵ تاڵە قسەی نێوان شاعیرانـــم دێتەوە یادو بە یەکیانەوە دەبەستم کلیلی تێکەیشتنی هەندێ دیمەنم ئەدەنێ کە ئەوسا تێ‌یان نەئەگەیشتم .

زۆر سەیرە هێشتا ئەم چەشنە بڕیارانەم لە بیر بێت : مەحوی سنعەتکارێکی گەورەیە ، پنەوێی سنعەتەکەی تین‌و سۆزی بە شیعرەکانی بەخشیوە .

بێخود ڕاوکەی نەبێت ناتوانێ شیعر بڵێـت « هەر لە لێکدانەوەی ئەم بڕیارەدا : « سەفوەت » ئەیووت : زۆرجار پارچە شیعرێك مانگێك بـــە دەستی‌یەوە دەخاێنێت . خۆی ئـەدا بەسەر دیوانی « کەلیم » و « بێدڵ » داو لە هەر چەند دێڕە دێڕێك دروست ئەکات . بەڵام وەستایانە دروستیان ئەکات. شارەزا نەبێت کەس ناتوانێ شوێن‌شوێن‌پێ‌ی کەوێت.

لەم کۆڕەدا شتێکی ترم لە یادە : وابزانم سی‌و پێنج ساڵی بەسەردا ڕۆیشتووە . با بەم چەشنە بیگێڕمەوە .

ڕۆژانی باسی تازەگەری‌و ڕوانگەبوو پرسیاری قوتابی‌یەکی شاعیرم ئەمەی هێنایەوە یادم .

پرسیارەکە ئەمە بوو : ئەمڕۆ ئەوەی پێشوو ئەم تازەگەری‌یەی پێ قووت ناچێ‌و لای پەشمە . لە ڕۆژی خۆیدا ئەوەی سەردەمی خۆی چی‌یان بـــە گۆران ووتوودو تازەگەری ئەویان لا چۆن بووە ؟ .

وەڵامم ئـەو یادداشـــتەبوو کـە ئێـــستا سی‌و پێنج ساڵی بەسەردا ڕۆیشتووە :

من نـــەمئەزانی چەندی پێ‌چووبوو ، شیعری گۆران بلاوبووبۆوە . بەڵام ئەوەندەم دەزانی کە ئەو چەند سروودەی لە ئێستگەی ئەوسای یافاوە بلاوکرابۆوەو لە قوتابخانە پێ‌یان لەبەرکردبووین شیعری گۆران بوون ــ کوردستان کوردستان : نیشتمانی جوان :

یا دەمی ڕاپەڕینە . یان : بەریبەیانە ڕووناکە ئاسۆ . « بێخودو سەفوەت » لە راستییا بە سۆزو ڕێزەوە لە سروودەکانی دەدوان . پارسەنگی سروودەکانی زێومریان ئەدایەوە . بەلام گالتەیان بە شیعری تری گۆران دەکرد من لە ( کێشو قافیە ) نەئەگەیشتم ، بەلام وەك دوایی تێی‌گەیشتم گالتەیان بە کێشەکانی شیعری گۆران دەکرد . کێشی پەنجەیان لا پەسەند نەبوو . ئێستەش بیرمە کە لە سەر ئەو کێشانە شیعریان بۆ گالتە دروستکردبوو :

ئایشێ شێتی گوێ‌درێژ        هەروا دەڕوا سەرەولێژ

بێخود بەداخەوە دەیووت :

ناجی عەبباس هەندێ شتی بۆ کتێبی قوتابخانە لە عەرەبی‌یەوە پێ‌کردم بە کوردی ــ هەر لەو پارچانە دەچوون ــ بەڵێن وابوو کە کتێبەکەی چاپ کرا پارەم بۆ بنێرێ نەینارد .

هەر دەربارەی گۆرانو ئەو سەردەمە لە بیرمە : سالی ١٩٤٥ بوو ، لە قوتابخانەی سەرەتایی بووم . تاقمێ دۆستی ئەدەب‌دۆست ــ کەریم بەگی حەمەد بەگی قادر پاشا ــ لە خورماڵ لای کۆبووبوونەوە ، بۆ سبەینێ بە سواری ڕوویان‌کردە سەرچاوەی زەڵم . بەدەم ڕێیەوە « ن . ناری » گەشتی هەورامانی گۆرانی دەخوێندەوە . ئەوانی‌تر ، شی‌یان دەکردەوە . هەر ئەو لایەنگری تەواوی گۆران بوو .

کۆمەڵە شاخی بەرزو گەردن کەش

ئاسمانی شینی گرتۆتە باوەش

هەموو لە « تەشبیە » و « ئیستیعارە » و « جیناس » و « تیباق » یان ئەپرسی : گۆران چی‌ی لێ‌کردن . ئایا ئاسمانی شین کۆمەڵە شاخ دەگرێتە باوەش ، یان بە پێچەوانەوە .

هەرپاش ئەو گەشتە ــ « ن . ناری » بووە مامۆستایەکی شیعرو نیشتمانپەروەریم . لەو تەمەنەدا یەکەم بلاوکراودی نهێنیم لادی ــ ژمارەی یەکەمی « یەکێتی‌ی تێکۆشین » م خوێندەوە . تەنیا لە دەنگو باسەکەی گەیشتم .

هەرچەندە باوکم زوو زوو ئەیووت : ئێمە بە تایفە شاعیرین . واتە ــ باوكو مامو خۆی‌و دوو برای شیعریان ووتووە . بەلام ئەیویست من لە شیعر دووربخاتەوە . شیعری بە ئەندێشەیەك دەزانی ، کە قوتابی لە خوێندن ، زانا لە کۆشش زانستیو قووڵ بوونەوە دوور ئەخاتەوە . شاعیری ڕاست بەدەم دێڕێکەوە دەبێ چەند شەو بێدار ، خەوو خۆراکی بۆ قەسیدەیەك لێ‌حەرام‌بێت .

بەلام « ن . ناری » هەر لەو پلەیەی خوێندنی سەرەتاییەدا زۆر شیعری نیشتمانی‌ی خۆی‌و سەلامو بێکەسی پێ لەبەرکردم .

« ن . ناری » ی مامم لە گەڵ خۆیدا بردمی‌یە مالی رەمزی‌ی مەلا مارف ، ردمزی وەك کوڕەکانی خۆیی فێری ئیلقای شیعر دەکرد ، یەکەم دەرسی ئیلقای دامی‌و چەند جار ڕای‌هێنام .

پارچەی « وەتەن چی‌یە » ی سەلامم لەبەرکرد ، لە نەورۆزی ١٩٤٦ دا ، بێکەس « بەهار نامەوێ جوانیت ببینم » ی خوێندەوە ، هەوری « خۆت هەڵتەکێنە ڕەنگینە کۆڵت » ی دا بە گوێی خەڵکدا . گەلێك قوتابی قوتابخانەی ناوەندی شیعری شاعیرانی تریان خوێندەوە ، من بچووکترین قوتابی بووم کە هاتمە پێشەوە مێزەکە لەمن بەرزتر بوو ، بە خوالێ‌خۆشبوو عومەر کەریم عەزیزو کامەرانی شاعیری ئێستامان هەڵیان‌گرتمو لە سەرمێزەکە دایان‌نام کە بە سۆزەوەو بە چەشنی ئیلقاکەی ڕەمزی شیعرەکانی سەلامم خوێندەوەو چەپلە بەرز بۆوە ،

لاپەڕەی یادگارو ئەو شایەتی‌یانە هەڵئەدەمەوە : چونکە زۆر سەرناوی تر هەیەو گەلێك کاتو لاپەڕەی دەوێ :

ــ یادی گەشتەکەی گیوی موکریانی‌و شیعرو کۆکردنەوەو بە جلی کوردی‌یەوە وێنەی شاعیران گرتن .

ــ گەشتەکانی عەلادین سەجادی‌و چەند کۆڕێ کە پیرەمێرد دەسکە گوڵی بوو .

ــ لە کۆڕی شاعیران نزیك‌بوونەوە : مەجلیسی رۆژانەی«هەردی‌و کاکەی‌فەللاحو چەند شاعیری‌تر».

ــ « گۆرانی مەزن » و لە نزیکەوە ناسینی . پێوەندیی خەباتی شۆڕشگێری وای کردین بە هاوڕێو دۆست کە جیاوازی پلەو تەمەن هەر بۆ ڕێزگرتن لە ناودا بمێنێ‌و بەرامبەر بە مێژوو شایەتێکی ڕاستگۆی بەرزیی گۆرانی شاعیر ، گۆرانی تێکۆشەر ، گۆرانی ئینسانبم .

ــ زۆر لەوە نزیکتر بوومە دۆستی« قەدری‌جان»و بوومە تاقە کەس ، یان یەکەم کەسێ کە بتوانێ ڕاستی‌ی ئیبداعو بەرزیی ئەو شاعیرو مرۆڤە بەرزە

له خەڵك بكەینێت .

هەر لەو سەردەمەدا «جگەرخوێن» و «عوسمان سەبری » م ناسی ـ هەریەکەیان لاپەڕەیەکی یادگارو چەند لاپەڕەی لە شیعر گەیشتن داگیردەکەن .

ـ « عەرەبی شەمۆ » نووسەرەو چەند مانگێکە لەشی بە خاك سپاردووه . بەڵام ئەمساڵ جەژنـی حەفتا ساڵە بۆ جاسمی جەلیل دەکەن‌و دەیان‌شاعیری تری کوردی سۆڤێتیش لاپەڕەی تایبەتی‌و کـۆڕی تایبەتی‌یان دەوێ .

ـ « ڕوانگە » و شیعری تازەو شاعیرانـی ئێستاشمان ، گەیی لە گلینەی شیعری کۆنـدا قەتیس‌بوونمان لێ‌ئەکەن .

بۆمان هەیە لەم لاپەڕەی یادداشت‌وڕابوردووەوە بێینە سەر ئەمڕۆ .

ئەبێ ڕابوردوو چی‌بێت ، ئەگەر چرای بینینی ئەمڕۆ ، گۆڕینی شۆڕشگێرانەی دواڕۆژنەبێت .

بەڵام بۆ ئەمڕۆو سبەینێش هەر ئەبێ باسی شیعر بکەین ؟ ئارنەست فیشەر ، سـەرەتای گرنگ ترین کتێبی خۆی بە دووبارە کردنەوەی قسەیەکی جان کوکتۆ دووبارە دەکاتەوە کە دەڵێ :

« ناتوانین واز لە شیعر بهێنین ، خۆزگە ئەمزانی بۆچ ! » .

ڕەگەزی شیعر لە پەخشانی زۆر لە نووسەرە هاوچەرخەکاندا ڕەنگ ئـەداتەوە ، تەنانـەت لای هەندێکی وەك « سین ئۆکازی » ، نزیك خستنەوەی پەخشان‌و دەربڕینی شیعری ، ئوسلووبێکی تاکـی ڕەنگینی دروست‌کردووە ، بەرهەمی پڕە لە پارچەی ئیقاعی بـە لەیەك چوونی دەنگ لایـەنی دەنگ لـە وێنەکەدا تەواو دەبێ‌و لە گەڵ قافیەی ناوەوەدا یەك دەگرن و دەستەیەکی بەیەکدا چووی سەجع لە بابەتی لیریك‌و سۆزدا دەردەکەون‌و شیعری لیریکی پەخشان ئامێز لەم لاو ئەو لادا بڵاوەو جێی ئینفیعالی نـاو چیرۆکن .

پەخشانیش لەمەیدانـی شیعردا هەردیارە ، ڕوخسارو کێشی کلاسیکی لای زۆر لە شاعـیران ناتوانن ئیقاعی ژیانی تازە بە جێ‌بێنن ، لەبەر ئەوە ڕوودەکەنە شیعری پەخشان‌ئامێز .

ئەم چەشنە شیعری پەخشانـە زۆربـەی هونەرمەندە شۆڕشگێڕە گەورەکانـی ڕاکێشـاوە ، وێنەی لە بەرهەمی گاستێڤ‌و برێشت‌و ئێلـوارو نێرۆداو نازم حیکمەت‌و میجلاتیس‌دا دەبینی‌و لـە شیعری ئینگلیزی‌و ئەمەریکادا وێنەی دیارەو لـە فەرەنسـەش «جان‌کیرۆل»و « سـان جۆن پێرس » واوە دەڕۆن .

ئەم ڕوخسارە تازەیە بریتی‌یە لە کێشی جاران‌و لە قافیە لادان ، قسەیەك جێیان دەگرێتەوە کـە دیمەنی دەرەوەی لە پەخشان دەچێت ، ئـاوازی ئیقاعیش جێی کێشەکە دەگرێتەوە . بەڵام لـە پاڵ ئەم نەویستن‌و ئەم لادانە لەو هۆ شیعری‌یانـەی پێ‌ی‌ڕاهاتبووین ، وێنە لە شیعری پەخشاندا هەر بە ڕێبازێکی شیعری‌و شیعریی تەواو بینادەکرێ‌و ناچێتە ناو ئەو وورده شتانەوە ( تفاصیل ) کە لە وێنەی پەخشانەکانی چیرۆکدا هەن . ئەم ڕوخسارە جێی خۆی گرتووەو شایانی بەردەوامی‌یە . ئەمەش هەر سەرەتابوو ، بۆ ئەوەی تێکرا بڕیارێك بەسەر شیعری ئەمڕۆماندا بدەین .

ـ بەڵێ ـ شیعریشمان هەیەو شاعیریشمان هەیە ، دەچمەوە سەر لاپەڕەی یادداشت‌و لە تواناما هەیە شایەتی‌ی بوون بە شاعیری دیلان‌و کامەران تۆماربکەم ، ڕای هەردیو ع.ج.ب‌و ڕابەری گۆران لاپەڕەیەکی ترن لە نزیکەوە تەقینەوەی شێرکـۆ بێکەسم وەرگێڕا بە عەرەبی ، خۆم لە لەتیف هەڵمەت بەدوورنەگرت ، چەند دێڕی « پڕ لە گێچەڵم » لـە بەرگی دیوانی « عەبدوڵڵا پەشێو » دا نووسی . جەماڵ شارباژێڕی‌و دیوانەکانی کەردسەی کۆمەڵە و وتارێکی ئێستگە بوون .

ـ سەردەمی ڕوانگەو لەوەدواش « نـەوەی پێشووی شاعیرو ڕەخنەگران » داوای بێدەنـگ بوونیان لێ‌دەکردم .

هاوڵێکی دەرس‌ووتنـەوەی زانـستگام یـان دووانیان ، لایان شەرم بوو ئێمە باسی « ئەولادی ئەم عەسرە » بکەین .

بەڵام شیعرمان هەیەو بەرەوپێشەوە دەڕوات :

ئەمەوێ شایەتی‌و بەووردی ڕەخنەدا ڕۆچوون بخەمە کاتی تایبەتی‌و مەیدانی نووسین‌و بۆ هەر یـە کە شوێن تەرخان‌کردنێك . بەڵام دەبێ ئەوەندەش بە شاعیرە تازەکانمان ـ بە شاعیردکانی ئێستامان بڵێین .

کە ڕوخساری هونەر ، ڕوخسارێکی بینراوو بیستراوی ئەوتۆ نی‌یە لە هۆشیاریی تاقە کەسێکەوە هەڵقوڵابێ ، بەڵکوو دەربڕینی تێگەیشتنێکی جیهانە

که باری کۆمەڵایەتی دەست نیشانی کردووە .

ڕوخسار ئامانجێکی کۆمەڵایەتی دەردەبڕێت . هەر وەك ناوەڕۆك زۆر لە باس‌و لە بیری سەرەکی گرنگترە ، با هەڵبژاردنی باسیش گرنگ‌بێت .

هونەرمەند هۆشی بە خۆی‌بێت یان نا ، هەر دەربڕی ڕێبازە کۆمەڵایەتی‌یەکانی چەرخی خۆیەتی . « هونەرمەند هەست هەر بەو شتانە دەکات کە چەرخی خۆی‌و زرووفی کۆمەڵایەتی خۆی‌پێشکەشیان کردووە . کە واتە خۆیەتی « ذاتیەت » ی هونەرمەند لەوەدا نی‌یە کە تەجروبەی ئەو لە بنەڕەتدا لە تەجروبەی هاوچەرخەکانی خۆی یان هاوچینەکانی خۆی جیابێت ، بەڵکو لەوەدایە کە تەجروبەکەی ئەو بەهێزترو هۆشیارانەترو خەست ترە . دەبێ پێوەندیی کۆمەڵایەتی‌ی تازە بە جۆرێك دەرخا کە خەڵکی تریش تێ‌ی بگەن‌و دەبێ بڵێ : فەرموون ئەمە شتێکی سەرنج‌ڕاکێشەرە » ل ٥٦ .

بەڵام شتە سەرنج‌ڕاکێشەرەکە هەردەبێ شیعربێت .

چەندیش باسی ڕوخساری تازەو شیعری ئازاد بکەین، هەر دەبێ ئەوەمان لەبیر نەچێت کە مۆسیقا بناغەی شیعرەو هەر بناغەشی دەبێت : چونکە کەسێك کە گیانی بە مۆسیقا چەش نەبێت نابێ بە شاعیرێکی ڕاستەقینە .

چەند مەسەلەو تێبینی‌تر ــ دەربارەی شیعری تازەمان هەیە :

باس لە نادیاری « غموض » ی وێنەو ناوەڕۆکی شیعری تازەمان ئەکرێت .

لەگەڵ هەموو ڕاستی‌و دروستی‌ی پەنابردنەبەر وێنە نەخشاندن‌و باڵ‌گرتن بە سەر ساکاری‌و سادەییدا ، فیشەر ڕاست دەکات کە دەڵێت :

ئەبێ هەموو خەڵك لە بەرهەمی هونەر بگەن‌و لێ‌ی ڕازی‌بن . هەر لە سەرەتاوە هونەر ئەرکی ئەوە نەبوو کە بە دەرگای کراوەدا دەربازبێت ، بەڵکو ئەرکی ئەوەیە دەرگای داخراو بکاتەوە .

کە واتە : دەرگای داخراو ــ بۆ خەڵك کردنەوە ، زۆر لەوە جیایە کە پەنا بەریتە بەر نیشانەو ڕەمزی نادیار ، تێگەیشتنی ئەمەش ئیبداعی ڕاستەقینەی دەوێت :

شیللەر دەڵێ :

جووتە باڵت بکەوەو ئازایانە بفرە

**جەماوەرەکەمان پەیمانی بە سەرکردایەتی‌یە شۆڕشگێڕەکەی خۆی دەدات کە هەڵمەتی گشتی‌ی نیشتمانی‌ی نەهێشتنی نەخوێندەواری سەربخات.**

بفرە بە سەر چەرخی خۆتدا
با کازیوەی دواڕۆژ لە ئاوێنەی تۆدا
بە چرپەش بێت
ڕەنگ بداتەوەو بریسکەی بێت .

لە شاعیرمان دەوێت بەسەر ئەم چەرخەدا بفرێت‌و بکاتە دواڕۆژبەڵام بەرامبەر بەشانازی‌ولەخۆبایی‌بوونی شاعیر دەکەوینە ورتەو ناڕەزایی :

ئەو ( سپیندەر ) ەی شاعیری ئینگلیز کە تەرکیزو ئیلهام‌و هاتنەوەبیرو باوەڕکردن‌و گۆرانی بە ڕەگەزی شاعیرێتی دەزانێت ، لەم هەموو بەهرەو توانایەوە دێتە سەر ئەو لەخۆبایی‌بوونەو دەڵێ :

« هەرچەندە شاعیر لە خۆبایی‌و پڕئاواتن ، بەڵام ئەو لەخۆ بایی‌بوون و ئاواتەیان پاکترین چەشنە شتی سەرزەمینە قەدیس ئاوات فڕێ‌دەداتەلاوە بەڵام شاعیر ئاواتی ئەوەیە کە خەڵك بەو چەشنە بیناسن کە لە تەجروبەی دووری‌و هەست‌و ئەستی ناسك‌و قووڵ‌و ئەوپەڕی لە ڕاستی گەیشتنیدا لە ناو شیعرەکانیدا دەردەکەوێ »

بەڵێ ئەگەر لای سپیندەر وابێ کە باوەڕی شاعیر بە خۆی‌و کەردسەکەی سەرچاوەی بەرهەمە گرنگەکانی ئەدەبیاتی جیهان‌بن ، ئەوا ئێمەش بۆمان هەیە بە دیوانی کۆندا چاوبگێڕینەوەو بڵێین :

فارس‌و کوردو عەرەب هەرسێم بە دەفتەر
گرتووە
ساحێبی سێ مولکە ( نالی ) ، ئەمڕۆ دیوانی
هەیە

شانازیمان لە هەموویان قبووڵ‌کرد ، لە هەموو لاوێکی بەهرەداری قبووڵ دەکەین ، بەڵام شانازی‌یەك کە بەرهەم ببەخشێ ، کە لە گۆڕینی واقیعی ناهەمواردا بەشداربێت ، کە دەنگی بەرەوپێش‌چوونی گەل‌و جوانی‌و بەهرەبێت .

# چەند سەرنجێکی زمانەوانییانە بەدوای گفتوگۆکەی مامۆستا نەریماندا لەگەڵ مامۆستا تۆفیق وەهبی

**محمد مەلا کریم**

لە ڕیزی ئەوانەدا خۆیان بە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیو تەقەلا بۆ دۆزینەوەی قانوونەکانیەوە خەریك کردووەو بەرهەمی سەرچاوەو بەکەلکیان پێشکەشی کتێبخانەی کوردیو خوێندەوارانی کوردو زانایانی کوردۆلۆژی کردووە ، مامۆستا تۆفیق وەهبی جێدەستێکی دیاری هەیە نەك تەنها کوردەکان خۆیان، بەڵکو ئەوانەش کە لەم مەیدانەدا کارئەکەنو شارەزای عەرەبی یا ئینگلیزین ، پێیئەزانن‌و سوودی لێ وەرئەگرن .

ئەوەی مایەی داخ‌و خەفەتە ئەوەیە ئەم زانا ئینسیکلۆپیدیاییەی زمان‌و ڕێزمانی کوردی ، وا بۆ چارەکە سەدەیەك ئەچێ نامۆیی بۆ خۆی هەڵبژاردووەو لە وڵاتی هەندەران ئەژیو خوێندەوارانی کورد لە بەرهەمی ئەم ساڵانەی بێبەشن‌و ، لەبەر بێدەسەڵاتی‌و کەمدەرامەتیی خۆیو نەبوونی کەسان‌و دەزگای بەدەربەسی کوردییەوە هاتوویش ، وڵاتانی هەندەرانیش سوودێکی ئەوتۆی لێ نابینن .

وەك مامۆستا نەریمان [ لە ژمارە ١٢ی ساڵی دووهەمی گۆڤاری ( ئاسۆی زانکۆیی ) دا ] بۆمان ئەگێڕێتەوە ئەم زانا گەورەیەمان لەم ساڵانەی پیریو کەنەفتیدا لە دووروڵات یازدە ـ دوازدە بەرهەمی بەکەلکی ئامادە کردووە لە فەرهەنگە کوردی ـ ئینگلیزییەکەی بەولاوەمان بەرچاو نەکەوتووەو وادیارە تا مامۆستایش لەم باری ژیانی ئێستایەیدا بژی چاومان بە دیتنیان ڕۆشن نابێتەوە . بۆیە پڕبەدڵ ئاواتەخوازی ئەوەم کاربەدەستانی دەوڵەت دەس‌وبرد بکەن بیهێننەوە بۆ وڵاتەکەی خۆمان‌و چەند سکرتێرێکی کارامەو لێهاتووی بۆ دیاری بکەن تا یارمەتیی بدەن بۆ پاکنووسیکردنی بەرهەمەکانیو نووسینەوەی بەرهەمی نوێ ، یا ئەگەر هەر خۆی ئارەزووی گەڕانەوەی نەبێ ، مانگانەیەکی باشی خانەنشینیی بۆ تەرخان بکەن بتوانێ لەوێ بە ڕەحەتی پێی بژیو لەگەڵ خەریکبوونیا بە نووسین‌و لێکۆڵینەوەوە دڵی لای کاروباری ژیانی ڕۆژانەی نەبێ . هەروەها ئاواتەخوازی ئەوەم دەزگایەکی وەك زانکۆی سولەیمانی لەگەڵی ڕێکەوێ بۆ لەچاپدانی بەرهەمەکانیو لیژنەیەکی کارامەو لێهاتوو بۆ بەجێهێنانی ئەم ئەرکە پیرۆزە پێکەوە بنێ .

مامۆستا نەریمان کە پێشتر ناوم‌هێناو پەنجەم بۆ وتارەکەی لە گۆڤاری ( ئاسۆی زانکۆیی ) دا درێژکرد ، لەو وتارەیدا باسی هەندێ بابەتی کردووە کە لە هاوینی ڕابوردوودا لەگەڵ مامۆستا توفیق وەهبی لە لەندەن لەبارەیانە گفتوگۆی کردووە . لەو گفتوگۆیەدا لەبارەی هەندێ زاراوەوە پرسیاری لە مامۆستا تۆفیق وەهبی کردووەو مامۆستایش ڕای خۆیی لەبارەیانەوە ڕوون کردووەتەوە . لەگەڵ ڕێزو قەدرزانینی زۆرمدا بۆ مامۆستا تۆفیق وەهبیو ڕاکانی ، حەزئەکەم ، لەگەڵ دەسمایەی کەمو کورتیشمدا ، چەند سەرنجێك لەبارەی هەندێ لەو ڕایانەی ئەوەوە دەرببڕم .

مامۆستا نەریمان نووسیویە کەوا مامۆستا تۆفیق وەهبی لایوایە :

● **( پەخشان )لەجیاتیی ( نثر ) هەڵەیە چونکە ( پەخشان ) لە ( بەخشین ) ەوە هاتووە .**

دیارە ئەبێ مەبەستی مامۆستا لەم ( بەخشین )ە ( بەخشین ) ی بەمەعنای ( لێبووردن ) بێ ، ئەگینا پێوەندێك لەنێوان دەعواو دەلیلەکەیدا نابێ . ئەگینا

ئەگەر مەبەستی ( بەخشینەوە ) ی بەمەعنای ( بلاوکردنەوە ) بێ ، ئەوە ئەبێ لەجیاتیی ( نثر ) زۆر دروستو ڕەوا بێ . ( نثر ) ی عەرەبی خۆی واتە ( بلاو کردنەوە ) . (نثر) ی بەرانبەری (نظم)یش واتە ( بلاوکراوە ) چونکە بەمەعنای ( منثور ) ە وەك چۆن ( نظم ) ی بەمەعنای ( شعر ) واتە ( منظوم ) یانێ (هۆنراوە) . وشە یا هۆنراوەتەوەو کۆکراوەتەوە کە ( نظم ) یا ( منظوم ) ی ای پێکدێ ، یــا بلاوەو کۆنەکراوە کە ئەبــێ بە ( نثر ) یــا ( منثور ) . ( بەخشان ) ی کوردیش جۆرە ( صفة مشبهة ) یەکە واتە ( ئـەوەی بەخشو بلاوکرابێتەوە ) . کەواتــە ( بەخشان ) پڕ بەپێستی ( نثر)ە .

**● ( وێژە ) لەجیاتیی ( ادب ) هەلەیە ، چونکە ( وێژە ) بەمەعنای ( تایبەت ) و ( پاك ) و ( خاوێن ) هاتووە .**

( وێژە ) بەو مەعنایەی کە مامۆستا تۆفیق وەهبی فەرموویەتی، ئێستا لە کوردیدا بەکارنایەت. من شارەزای زمانی ( پەهلەوی ) نیم کە زانایان ئەڵێن بنچینەی کوردیـیە تا بزانم لەوێ ( وێژە ) ئــەو مەعنایەی هەیە یا نییەتی کە مامۆستا تۆفیق وەهبی باسی ئەکات ، بەلام ئەوەندە ئەزانم لە فەرهەنگـە فارسیەکانی ئەم چەرخەدا ( وێژە ) بەمەعنــای ( تایبەت ) و ( پاك ) و ( خاوێن ) و شتیوا هەیە . ئەوانەی ئەمڕۆ لە کوردیدا ( وێژە ) بەمەعنای ( ادب ) بەکارئەهێنن ، هەرچەند لە خۆیانـم نەبیستووەو ئەمدیوە نووسیبێتیان ، بەلام وای بۆ ئەچم کــە لایان وابێ لە (وتن) ی لای خۆمانو (بویژ [ بەمەعنای : بلێ ] ) ی هەندێ دیالێکتی کوردییەوە هاتووە . هەرچۆن بێ ، مامۆستا تۆفیق وەهبی ڕاستـی فەرمووە ( وێژە ) بۆ ( ادب ) هەلەیەو ئەو مەعنایەی ئێمە مەبەستمانە لە ( ادب ) لە ( وێژە ) دا دەسگیر نابێ ئیتر لە هەرچییەوە هاتبێ .

**● ( مێژوو ) لەجیاتیی ( تاریخ ) هەلەیە ، چونکە ( مێژوو ) بەمەعنــای ( پێشــین ) یــان ( ڕابواردوو ) ە .**

مادەم ( مێژوو ) لە ( مێژ ) وەرگیرابێ ، وەك لێك نزیکی مەعنایان وا ئەگەیەنێو (مێژ) یش بەمەعنای ( پێش ) بێ ، زۆر لە جێی خۆیا ئەبێ بەمەعنای ( تاریخ ) بەکاری‌بێنین کە زیاتر باسی ( ڕابوردوو ) ئەگەیەنێ . بەلای منەوە ئەوەی لەم وشەیەدا شایانی لێکۆڵینەوە بێ ڕیشەی مەعناکەی نییە کە لاموایە ڕاستە ، ( وو ) ەکەی پاشبەندییەتی کە نازانم بەپێی چ قانوونێکی زمانەوانی هاتووە .

سەبارەت بە بەکارهێنانی ( دێریك ) یش بــە مەعنای ( تاریخ ) کە مامۆستا فەرموویەتی جەلادەت بەدرخان بەکاریهێناوە، ئەمیش هەر وەك (مێژوو)ەکە وایە ، چونکە ( دێر ) واتە ( متأخر ) یا ( کۆن ) کە ( متأخر ) ەکەیش ڕوویەکیتری مەعنای (کۆن)ەکەیە. لە کوردیدا هەیە ( دێرزەمان ) واتە ( لە سەردەمێکی زۆر لــەمێژدا ) . ( دێر ) بــەمەعنــای ( درەنگ ) و ( زۆر ) یش هاتووە . ئەڵێن ( دێرە بڕۆ ) واتــە ( درەنگە بڕۆ ) ، یا ( دێرم پێچوو ) واتــە ( زۆرم پێچوو ، دواکەوتم ). (یك) ەکەیشی لاموایە نیشانەی ( صفة ) یەتی بێ وەك ( یك ) ی ( تاریك ) کە (تار) خۆی مەعنای ( ڕەش ) ئەگەیەنێ .

**● ( گۆفار ) لەجیاتیی ( مجلة ) هەلەیــە ، ( گۆوار ) تەواوە ، چونکە ( گۆفار ) بەمەعنــا ( مجموعة ) یە .**

چش با باسی پێوەندی ئــەم دەعواو دەلیلەیش نەکەین . بەلام خۆزگە مامۆستا ئــەوەی ڕوون بکردایەتەوە کە چۆن ( گۆوار ) بەمەعنای ( مجلة )و ( گۆفار ) بەمەعنای ( مجموعة ) یەو بۆچیو لەچییەوە هاتوون ؟ ئەگەر ئێمە نەمانەوێ زمانەکەی خۆمــان ئالۆز بکەینو سەر لە خۆمان بشێوینین ، ئەوا (گۆوار) واتە ( شتێ وەك « گۆ » وابێ ) و ( گۆفار ) یش ، من بزانم ، ناچێتەوە سەر هیچ ڕیشەیەکی کوردی .

**● ( شــار ) لەجیاتیی ( مدینة ) هەلەیە . چاکتر وایە بووترێت (شارستان) . بۆ ( محافظ )یش ( شاردار ) . ( شارە مێروولە ) خانووی مێروولەیە .**

کورد هەموو لەجیاتیی ( مدینة ) ی عەرەبـی وتوویانەو ئەڵێن ( شار ) و زمانیش زمانی میللەت خۆیەتیو کەس بۆی دروستناکا . شێخ مارفـی نۆدێیش لە ( ئەحمەدی ) یەکەیدا ئەڵێ :

**( مصر ) و ( مدینة ) گــەورە شــارە**
**( مسجد ) مزگەوت ، ( سوق ) بــازارە**

( شارستان ) یش بەپێی ڕێو شوێنی زمانی کوردی واتە ( ولاتی شار ) یا ( کۆمەڵە شار ) . کە بە ( شار ) ئەوتری ( شارستان ) لەبەرئەوەیە ئەوەندە گەورەیە وەك کۆمەڵە شارێك بێ ، واتە هــەر گەرەکێکی شارێك بێ ، وایە. لەگەڵ ئەوەشدا تائێستا

نەبیستراوە کوردێك بڵێ ( من خەڵکی شارستانی سولەیمانیم ) و مەبەستی ئەوەبێ ( من خەڵکی شاری سولەیمانیم ) . هەر بە قسەکەی مامۆستا خۆی کە هەڵەبێ ( شار ) لەجیاتیی ( مدینة ) بەکار بهێنرێ ، ئەبێ لەجیاتیی ( محافظ ) یش بڵێین ( شارستاندار ) نەك ( شاردار ) ڕاستەکەشی وایە ، چونکە ( محافظ ) ناوچەیەکی بەدەستەکە لە چەند شارێك پێکهاتووە . ( شارە مێروولە )یش بەومەعنایە کە وشەی ( خانوو ) ئەیبەخشێ ( خانووی مێروولە ) نی‌یە چونکە ( خانوو ) بۆ تاقە خێزانێکە ، کەچی ( شارە مێروولە ) هەزاران مێروولەی تیا ئەژیو تاقەیەك کونی گەورە نی‌یە ، لە بنی عەرزەوە هەزاران کونی جیا جیایە ، هەرچەند یەك یا چەند دەرگایەکی کەمی بۆ دەرەوە هەبێ .

لێرەدا جێی خۆیەتی بڵێم من وەك بزانم یەکەم کەسم ( شارستان ) م لەجیاتیی لواء یا ( محافظه ) بەکار هێناوەو ئەمەشم پێشنیارکردبۆ لێژنەی دانانی ( زاراوەکانی کارگێڕی ) لە ( کۆڕی زانیاری کورد ) بەڵام بەگوێیان نەکردمو وشەی ( پارێزگا ) یان بۆ داتاشی کە ئەویش ، وەك ( محافظه ) ی عەرەبی ، هیچ پێوەندێکی بەو مەعنایەوە نی‌یە کە لە وشەی ( محافظه ) دا مەبەستە . من لەگەڵ ( شارستان ) دا بۆ ( محافظه ) ، ( هەرێم ) و ( ناوچە ) شم بۆ ( قضاء ) و ( ناحیه ) پێشنیارکرد . لەمانیشدا هەر بەگوێیان نەکردم ، بەڵام خۆم هەر سێ زاراوەکەم بەمەعنایانە لە ( دیواني نالی ) دا بەکارهێناوە .

● **( سروشت ) بۆ ( طبیعة ) هەڵەیە ، (سرشت) تەواوە .**

وشەکە ، ( سروشت ) بێ یان ( سرشت ) بێ ، لە ئەدەبی کلاسیکی کوردیدا بەمەعنای ( طبیعت ) بەکارنەهێنراوە . لە فەرهەنگە فارسی‌یەکانیشدا ( سریشت ) ە و بەمەعنای ( فطرە ) و ( خلقة ) و شتی‌وایەو پێوەندێکی ئەوتۆی بە ( طبیعة ) مەوە نی‌یە . من خۆم لێم ئاشکرا نی‌یە چۆن بەمەعنای ( طبیعة ) هاتووەتە کوردی‌یەوە ، هەرچەند دیارە ئەگەر لە بنچینەدا ( سریشت ) بووبێ ، لەبەر ئاسانی لەسەر زمان بووە بە ( سروشت ) .

● **( باشوور ) بۆ ( جنوب ) هەڵەیە ، (نیوەڕۆ) تەواوە . ساسانی‌یەکان لەجیاتیی ( جنوب ) (هور)یان بەکارهێناوە کە ( نیوەڕۆ ) ئەگرێتەوە .**

بەڵام مامۆستا، بەداخەوە، ڕوونی نەکردووەتەوە پێوەندی جیۆگرافیایی ( جنوب ) و ( نیوەڕۆ ) بەیەکەوە چی‌یە لەکاتێکا کە خەڵك ( نیوەڕۆ ) بەرانبەر بە ( بەیانی ) و ( چێشتەنگا ) و ( ئێوارە ) بەکاردێنن ؟

● **( زانستن ) بۆ ( علم ) هەڵەیە ، ( زانست ) تەواوە . ( زانشی‌خواز ) ( طالب العلم ) ئەگرێتەوە . هەروەها دەبێت بووترێت ( ئەنجومەنی زانش ) نەك ( کۆڕی زانیاری کە لە ڕۆحی عیلمی‌و زمانەوە دوورە .**

بەر لە هەرچی من وای‌بۆئەچم ( زانستن ) و ( زانشی ) هەڵەی چاپ بن . ( زانستی ) و (زانش) بن لەبەرئەوە کە نەبیسراوە کورد بڵێ ( زانستن ) و مامۆستا خۆی لەپاشەوەش ئەڵێ ( زانش ) .

ئەنجا من لاشم‌وایە ئەم تیپی (ش)ە بۆ گەیاندنی مەعنای چاوگایەتی لەگەڵ ئێستای کوردی ناگونجێ . مامۆستایەك ئاگاداری کردم کە زوو بووە بەڵام لەگەڵ (ت)یەك لەدوایەوە وەك ئێستاش لە ( خۆرشت ) دا ماوە ، بەڵام ئێستا بە بێ (ت) لە کوردیی ڕەسەندا لە چەند وشەیەکی وەك ( کۆشش ) دا نەبێ نی‌یەو لام‌وایە دروست نەبێ بە قیاسیش وشەیەی‌تری‌وا دروست بکرێ یا وشەی کۆن زیندوو بکرێتەوە پاش ئەم هەموو گۆڕانەی بەسەر زمانەکەماندا هاتووە . تەنانەت وشەیەکی وەك ( وەرزش ) یش لە ڕێگای فارسیی نوێوە هاتووەتە کوردی‌یەوە . ئەنجا بۆ ئەبێ ئێمە تەعبیری ( طالب العلم ) دەق بکەین بە کوردی ؛ بۆ وەك ئەم خەڵکە ئەڵێین ( قوتابی ) ؟ ئەی بەرابەر بە ( کۆڕی زانیار ) یش ، کە منیش وەك مامۆستا لێی ڕازی نیم ، بۆ وەك ئەم هەموو جیهانە ئەڵێین ( ئەکادیمی ) ؟

● **( ڕەخنە ) بۆ ( نقد ) هەڵەیە چونکە ( ڕەخنە ) بەکوردی ( کون ) ئەگرێتەوە . لەجیاتیی ئەمە بووترێت (وردەڵی‌گرتن) وەیان (بەسەراچوونەوە) تەواوترە .**

ڕاستە ( ڕەخنە ) بەمەعنای ( کون‌و کەلەبەر)ە ، بەڵام بەمەعنای ( نقد ) یش زۆر لەجێ‌یە لەسەر بناغەی ئیستیعارە . پێوەندەکەشیان ئەوەیە وەك چۆن کون‌و کەلەبەر لە دیوارا ناتەواوی‌یە ، ناتەواوی‌یەکانی بابەتی ڕخنە لێ‌گیراویش وەك کون‌و کەلەبەر وان لەو بابەتەدا . ئەڵێین ( ڕەخنە لە فلانە وتار ئەگرم ) واتە ( کون‌و کەلەبەرو ناتەوایی تیا بەدی‌و دەستنیشان ئەکەم .

● **( کێش ) بۆ ( وزن ) ی شیعر هەڵەیە چونکە**

**( کێش ) سەنگە نەك ( وزن ) . هەر ( سەنگ ) خۆی بووترێت تەواوە .**

قسەکەی مامۆستا تۆفیق وەهبی تەواوە ، بەڵام لام‌وایە مامۆستا نەریمان باشی وەرنەگرتووە . ئەبێ مامۆستا وەهبی وتبێتی « چونکە ( وزن ) سەنگە ، نەك ( کێش ) » .

**● ( سەروا ) بۆ ( قافیە ) هەڵەیە ، ( کۆك ) تەواوە چونکە کورد ئەڵێ ( فلانو فلان کۆکن ) .**

ڕاستە ( سەروا ) بۆ ( قافیە ) هەڵەیەو (سەروا) هەر کوردی نی‌یە ، دروست کراوی ناشی‌یەکە . بەڵام (کۆك ) یش مەعنای ( قافیە ) نابەخشێ . ( قافیە ) دوا وشەی هەر نیوە بەیتێکە . لە شیعردا بەو دواتیپانەی نیوە بەیتەکان ئەڵێن کە وەك‌یەکن . ( کۆك ) یش واتە ( گونجاو ) و ( منسجم ) . ئێمە ئەڵێین ئەو دوو بەیتە هاوقافیەن یا قافیەیان چون‌یەکە ، بەڵام ناڵێین‌و ناتوانین بڵێین ( هاوکۆکن ) یا ( کۆکیان چۆن یەکە ) . تەنانەت ناشتوانین بڵێین ( کۆکن ) .

**● ( ڕاناو ) بۆ ( ضمیر ) هەڵەیە ، ( لەبۆناو ) تەواوە . لە هەورامی‌یشدا ( پەری‌ناو ) ئەوترێت .**

ڕاستە ( ڕاناو ) هەڵەیە . هیچ نەبوایە (جێ‌ناو) بوایە هەر نەختێ ڕێی تێ‌ئەچوو . بەڵام ( لەبۆناو )یش بۆ دانان بە زاراوە دەست‌نادا . لەوە ئەچێ بە ( چاکەت‌و پانتۆڵ ) بڵێین ( بۆ بنیادەم دووراو ) ! من لای خۆم ، خۆم بە هەورامی‌زان ئەزانم ، بەڵام تائێستا ( پەری‌ناو ) م نەبیستووە .

**● ( چاوگ ) بۆ ( مصدر ) هەڵەیە . ( چاوگە ) تەواوە . کورد ( چاوگەی ئاگر ) ی بەکارهێناوە .**

( چاوگ ) یش ڕاستە . لای ( هەڵەبجە ) دێ‌یەك هەیە ناوی ( کۆکۆیی ) یە لەسەر کانی‌و ئاوێك دروست‌کراوە ، بۆیە پێی ئەڵێن ( کۆکۆیی چاوگ ) ، بەرابەر بە دێ‌یەکی‌تر کە پێی‌ئەڵێن ( کۆکۆیی چنار ) .

**● ( گەل ) بۆ (جمع) هەڵەیە ، ( گەل‌کردنەوە ) تەواوە .**

لە کوردیدا ( جمع ) دوو مەعنا ئەبەخشێ ( گەل ) یش‌و ( گەل‌کردنەوە ) یش . کە بڵێین ( جەمعی [ کتێب ] چی‌یە ؟ ) ئەوە واتە ( گەلی [ کتێب ] چی‌یە ) و لە وەڵامدا ئەڵێین ( کتێبەکان ) . کە بیشڵێین ( وشەی [کتێب] جەمع بکەرەوە ) ئەوە واتە ( بیکە بە گەل ) یا ( گەلی بکەرەوە ) . بەڵام ئێستا لەناو زمانەوانەکاندا ( کۆ ) باوەو لامەوایە ئەمیش لەسەر زمان ئاسانترە تا ( گەل ) کە ( گەل ) مەعنای نزیکەبیری‌تریشی هەیە .

**● (فرمان) بۆ (فعل) هەڵەیە. هەر (فعل) خۆی بەکار بهێنرێت چاکترە .**

ڕاستە (فرمان)ی کوردی بۆ مەعنای زاراوەی (فعل) دەست‌نادا چونکە بۆ (کاری بەدەست) بەکاردێ‌و لەبەرئەوە لەگەڵ مەعنای زاراوەی (فعل) یەك‌ناگرێتەوە ، بەڵام (کار) بۆ هەموو جۆرە کارێکی مایەیی ، بە دەست بێ یا بە بیر یا بە ئامێر ، هەروا بۆ کاری مەعنەویش بەکاردێ . کەواتە (کار) بەکاربێنین لە (فعل) باشترو بەجێ‌ترە .

**● (زاراو) بۆ (مصطلح) هەڵەیە ، (زاراوە) تەواوە .**

بەداخەوە مامۆستا ڕوونی نەکردووەتەوە بۆچی! ڕاستەکەی هەرکامیان بگرێ ئیستیلاحێکی تازە دروست‌کراوە . جا ئەگەر لە (زار)و (ئاو)ەوە هاتبێ بەمەعنای (وەك ئاوی دەم)و بە مەبەستی (هەمیشە بەسەر زمانەوە بوو) ، ئەوە جیاوازی‌یەك لەنێوانیانا نابێ ، بەڵام ئەتوانم بڵێم (زاراوە) لە هەردووکیان لەسەر زمان سووکترە .

**● (من) تەنها لە ماضیی موتەعەددیی وەك (من خواردم ، من نووسیم)و هەروەها لە مەفعوولوبیهی بەکاردەهێنرێت وەك (تۆ منت دیوە) . بەڵام لە حاڵەتی (نۆمیناتیف ـ رفع) دەبێت (ئەز) بەکاربهێنین وەك (ئەز مامۆستام ، ئەز دەچم ، ئەز بم بەقوربانت) .**

ڕاستەکەی ، ئەم دارشتنەی قانوونی ناسینی خاسیەتەکانی (من)و (ئەز) کە مامۆستا نەریمان داویەتە پاڵ مامۆستا تۆفیق وەهبی بەشی جیاکردنەوەیەکی پوختی ئەو دوو ضەمیرە ناکا ، چونکە جگە لەو حاڵەتانەی کە ئەو ناوی ناون (ماضیی موتەعەددی)و (مەفعوولوبیهی)و (حاڵەتی ڕەفع) حاڵەتی زۆر هەیە باسی نەکردوون کە ئەبێ یا (من) یا (ئەز)یان تێدا بەکاربهێنرێ . دیارە بەر لە هەرچی باس باسی شوێنی (من) یا (ئەز)ە لە ڕستەدا : لە چ‌حاڵەتێکی ئیعرابیدا (من)و لە چ‌حاڵەتێکدا (ئەز) بەکارئەهێنرێ ؟ ئەنجا حاڵەتی ئیعرابی لە کوردیدا چۆن تەماشا ئەکرێ ؟ وەك لە عەرەبیدا کە حاڵەتی ڕەفعەو نەصبەو جەڕە هەیە کە ئەمانە وەك سەرو بۆرو ژێر هیچیان لە کوردیدا نین‌و مەگەر بەپێی

شوێن بلێین ئەم حاڵەتە لە حوکمی فلأنە ئیعرابدایە، یا چۆن ؟ پاشانیش ، مامۆستا باسی کام دیالێکتی کوردی ئەکا ؟ هەموو ئەزانین ئێستا لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووددا ( ئەز )بەکارناهێنرێو لە هەموو حاڵەتێکدا هەر ( من )ەمادەم ضەمیری مونفەصیل بەکاربێنین . لە پاشماودی زوویش تەنها پارچە شیعرێکی نالیو یەك دوو پەندی پێشینانو یەك دوو نموونەی دیالێکتی گۆرانیمان بۆ ماوەتەوە (ئەز)یان لەجیاتیی (من) تیا بەکارهێنرابێ . بەش‌بەحاڵی کرمانجیی ژووروویش ، وەك من لە دیوانی (مەلایێ جزیری)یەوە بۆم ساغ‌بووەتەوە (ئەز) تەنها لە حاڵەتی ڕەفعەداو (من)یش لە هەموو حاڵەتێکدا بەکاردێ .

★ ★ ★

ڕاستەکەی ئەمڕۆ زمانی کوردی گیرێکی خراپی بەدەستی دروست‌کردنی وشەی نارەسەن ، یا لە بنەچەدا ڕەسەن بەڵام بە ناشی‌یانە دروست کراوەوە، خواردووە . بە بۆچوونی من سەرچاوەی ئەم بارە نابارە لەوەوەیە ڕۆشنبیرانی ئەمڕۆمان کە تەماشای ژیانی ئەم چەرخە ئەکەنو ئەم پەرەسەندنە بەپەلەیەی زانستو تەکنیك ئەبینن‌و ، ئەبینن زمانەکەمان بەفریای گەلێ لە پێویستی‌یەکانی ژیانی شارستانەتیدا ناگات ، بیر لەو ڕاستی‌یە ناکەنەوە دەولەمەندیی هەر زمانێ بەگوێرەی پێویستی‌یە ژیواری‌یەکانی کۆمەڵی خاوەنی ئەو زمانەیەو ، بۆ چارکردنی ئەم ناتەواوی‌یە پێویستمان بەوەیە کەسانی زمان‌زان‌و پسپۆڕو لێ هاتوو کێوماڵێکی ورد بە هەموو دیالێکتەکانی زمانەکەمانا بکەن ، هەرکەسە لە ناوچەی خۆیەوە ، بەڵکو وشەی شیاوو گونجاو بۆ هەندێ لەم بابەتە تازە هاتووە ئارایانە بدۆزنەوەو ، ئەگەر نەیاندۆزی‌یەوە بەپێی ڕێو شوێنی زانستی زمانەوانی‌و لەگەڵ ڕەچاوکردنی قانوونەکانی ڕێزمانی زمانی کوردی ، وشەی لەبارو ڕاستی بۆ داتاشن ، بەڵکو هەریەکە لەلای خۆیەوە ، وەك بڵێی عەیبی لێ بێ کوردی وشەی دانراوی ناو پاکەتی بۆ هەموو بابەتێکی ئێستاو لەمەولا نەبێ ، ئەکەوێتە وشە دروست‌کردن . ئەوەتە ئێستا ئەبینین سەدان وشەی‌وا هاتووەتە زمانەکەمانەوە- یا هەر لە بنەڕەتدا دەست‌هەڵبەست‌و ساختەن ، یا ڕیشەیەکە ڕاستیان هەیە ، بەڵام بەشێوەیەکی ناڕاست دروست‌کراون .

## بەسەرکردایەتی «بەعس» و هاوکاری هێزە نیشتمانی‌یەکان نەخوێندەواری لەناو دەبرێت .

من ئێستاو لەم وتارەدا توانای ئەوەم نی‌یە سەرژمێرێکی وردی ئەم جۆرە وشانە بکەم ، بەڵام بۆم هەیە بپرسم ئەوەی سی ـ چل ساڵ لەمەوپێش وشەی (بایەخ)ی کوردیی نەزانیوەو ( گرنگ)ی داهێناوەو ، ئەوەی لەم ساڵانەی دواییدا وشەی (تەوزیمی)ی بۆ دروست‌کردووین کە لەمڕۆژانەدا بەبۆنەی هێرشی ڕیشەکێش کردنی نەخوێندەواری‌یەوە بە هەموو گۆڤارو ڕۆژنامەو کتێبەکانماندا بڵاو بووەتەوە ، چۆن دڵو دەروونیان ڕێی‌دان ئەم دوو وشە نارەسەنە بخەنە زمانی گەلەکەیانەوە ؟ لە کێ‌یان بیست ؟ لە چیدا خوێندیانەوە ؟ لە کوێ دۆزی‌یانەوە ؟ یا ئەوانەی ئەوەندە نەشارەزای ڕێو شوێنی زمانەکەی خۆیانن (هاوڕێ)و (هاوماڵ)و هاو هەزار شتی‌تریان بەبیردا نەهاتووە (مواطن)ی عەرەبی‌یان لەجیاتیی (هاونیشتمانی) تەرجەمە کردووە ، دڵ بە کام کوردی زانینی خۆیان خۆش ئەکەن ؟

ئەمڕۆ ژیان بە ڕۆژێ ئەوەندەی چەند ساڵی لەمەوپێش پێش‌ئەکەوێو ، ڕۆژ نی‌یە سەدان شتی نوێ دانەهێنرێ . زمانیش نی‌یە لە دنیادا بتوانێ بەرگەی ئەم پێش‌بڕکەیە بگرێو بە تەنیا خۆی بەفریای ئەم هەموو شتانەدا بکاتو وشەی خۆماڵی‌یان بۆ دابنێ . ئەوانەی وا بیرئەکەنەوە تووشی دەردی نەتەوەپەستی‌یەکی یەجگار کوێرانە بوون . بۆیە پێویستە بەوپەڕی دڵ‌فراوانی‌یەوە ، زاراوەی نوێی زانستی ، بێ‌گوێدانە ئەوە کە خاوەنەکەی کام نەتەوەیە ، بهێنینە زمانەکەمانەوەو تەنها لەم ڕێگایەوە ئەتوانین زمانەکەمان ددوڵەمەند بکەین‌و بیکەین بە زمانی زانستو ، هەر لەم ڕێگایەشەوە ئەتوانین لە داوی ئەو وشە نارەسەن‌و نازانستی‌یانەی ڕزگار بکەین کە کتێبو ڕۆژنامەو گۆڤارەکانمان‌و بەرنامەکانی ڕادیۆو تەلەفزیۆن‌و قسەی ڕۆژانەمانیان پڕ کراون‌و زمانێکی‌وامان بۆ دروست‌بووە زوربەی هەرە زۆری ڕۆڵەکانی گەلەکەمان تەقەی سەریان لێ دێ .

# کانیێ

**ابراهیم سلمان**

هێشتا خەوا دناڤ چاڤادا ... ژناڤ نڤینێت خۆ لسەر کەبرا چولی ددرکەڤت .. پشتو پشت بپێبە لیسکێدا دهاتەخوارێ .. پێ وێ لسەر پەیسکا دویماهیکێ تەحسیو چۆکا وێ یادی ڤێکەڤت ... دەستێ خۆ هاڤێتە چۆکا خۆ .. ئاهێنەك ژ دەڤی دەرکەڤت .. گاڤەکێ ما .. پاشی رابوڤەو دەستێ خۆ هاڤێتە گوزکێ ئاڤێ دیت یێ سڤكبو .. هەلگرتو دانا سەر ملێ خو هێشتا خەوێ باش چاڤێت وێ نەبەردابنە .. چیاو دۆلو نهال یێ بێهنا خۆ هەلدکێشن هێش بایێ تەزی نەبویە گوری .. شڤانی پەزێ بری ... گاڤانی حەیوانەتێت برین بو چەراندنێو روژا دەرکەڤتی .. هێشتا چیای سیبەرا خۆ یا لسەر گوندی راێخستی ... ژ ددرازینکا خانوی دەرکەڤت .. بکولانادا چو خوارێ قەستا کانیکا ئاڤێ کر ... برێڤە های ژ کەسەکێ نەبو ژبلی ئاخڤتنەکێ د سەریدا دهاتەگوتن..

« زەریا گوندێ مە تۆی ...
رەوشا هەمی زەری‌و نەسمەرا تۆی ..
بێهن هەلکێشانا بهارێ تۆی ..
ئاخینکا بۆ تە رادهێلم .. »

جار دکرە ستران‌و جار برەنگەکێ بخەمڤە دگوت .. و ... نەدزانی کانێ دێچیت یان ناچیت... هەکە چوژی چ بێژیتێ ؟ ئەو دێ چ بێژیتێ ؟ رویێت وێ دگەش‌بون ئێکی ماتەك لێدابا خوین دا خۆ تێ هەلاڤێت. جار دا خو بینیت خوش یادچیت ... جار هێدی .. جار دڤیا بکەتەکەنی .. جارژی هزردکر یانڤستیە جلفەك ڤێدکەت .. هەر هزرێت خۆ دکرن کا چاوا شەڤا بوری هێلا دەستێ خو بکەتە ددستێ وێ ؟ ! بۆچی دەستێ خۆ ژ بن دەستێ وی نەدکێشا ... هەکو سترانگۆتین بۆچی دگەل دەنگێ وی هزرو خەون لێ مشەبون ... « هەکو ئەز مرم...

بلا هەستیکێت من بهاڤێنە د رێکا کانیکێ‌دا
هەکو جانا مَن دهێت ..
جەرێ لسەر ملی ..
بەلکی چیکەکا ئاڤێ ژ جەرکی
بکەڤیتە سەر هەستیکێت من ...
دێ رابمە سەر پیا .. »

ستران‌و ئاخڤتنێت وی هەر ل هزرێ بون‌و برێڤە دچوو هزردکرو دگەل خۆ دگوت .. « ئەز چ بکەم .. ؟ ما ئەڤە ژمن ڤەنابیت ؟ دخەوێداژی دگوت ئەز دێ لهیڤیا تە بم .. نەء .. نەء ئەز ناچم .. نەکو ئێك من ببینیت .. لێ ما دێ چ بێژمێ هەکە ئەز چووم .. ئەز نەڤ گوینە ..هە .. پا .. نەکو .. نەکو لالبم ؟ هی ... ئەز چەند شەرمدکەم .. هەکو بوان چاڤێت دژوار بەرێخو ددەتە چاڤێت من ئەز پاشی دێ چاڤێت خۆ ل کیرێ ڤەشێرم .. نەء .. دڤێت بچم‌و چاڤێت خۆژی ناڤەشێرم ... باشە هەکو گۆتیە من دێ هێ‌ی یان نەء بۆچی من نەدگوتێ .. ئەز ناهێم .. بۆچی من نەدگۆتێ تە چ ژ منە ؟ دێ مینیتە لهیڤیا من دڤێت بچم ... ئاخڤتنێت وی چ دگەرمن .. خویسێن بسەر دلێ مندا دچیتەخوارێ ... دەنگێ وی چەندێ خۆشە هەکو سترانا دبێژیت .. بەژنا وی هەکو وان شەل‌و شەپکێت سپی دکەتە بەرخۆو کولاڤدەرسۆکێت خۆ خاردکەت وەکی روژێیە هەکو سپێدێ دهەلێت ... باشە ما کی دبێژیت کو نەگۆتیە ئێکا دیژی ؟ نەکو ترانێت خو بمن بکەت ؟ پاشی .. پاشی ئەز دێ چکەم ؟ کا بۆچی شڤێدی من هێلا دەستێ من بکریت .. خوزی من ناڤچاڤێت خو لێ شینکربانە .. لێ ما ئەز ژکیڤە دشیام بەرێخو بدەمە چاڤێت وی‌و ئەنیا خۆ گرێکەم .. ما من هویڤی نەدکر دەستێ من ڤ دەستێ وی بکەڤیت ؟ ئوه .. ئەڤە چیە ئەز دبێژم ؟ باشە پا هەکە هەڤالەکا من ئەز دیتم دێ چ بێژم ؟ نەکو ببێژیتە خەلکی ؟ هەمی دێزانن .. هەمی دێ بەحسێ مە کەن .. نەکو برایێت من وی بکوژن ؟ یان من بکوژن .. نەء .. نەء .. بلا وی نەکوژن .. بلا من بکوژن .. بەلێ ئەز دزانم ئەو دێ من رەڤینیت بەری بشێنە مە .. پاشی نەکو وەکی خەجۆو سیامەندا لێبهێین ... ها ... نێ شڤێدی دبەر تویتن رستنێرا ئەو سوحبەت دکر .. ما نەوەیە ؟ .. ها .. دڤێت من بۆ خۆ برەڤێت ؟ .. ئها .. من زانی ! ! نە .. نە .. ما دەم ودسایە ئەز ناچم ... لێ گونەهە

**دامەزراندنی کۆمەڵیکی خوێندەواری شۆڕشگێڕ ئەرکی سەرشانی تێکۆشەرە دڵسۆزەکانە .**

**لە رێگای هوشیاری و هەست کردن بەم لێپرسراوێتیەوە کۆمەڵیکی خوێندەوار دێتە دەست .**

بتنێ بمینیتە لوێرێ .. ئەگـــو برسی ببیت ؟ . نەء دڤێت بچم .. ئەرێ نزا دەنگێ وی بێ چەوایە ؟ چاڤێت وی دچەوانە ؟ هەی مـن ژبیرکرن .. ئەگو ئەز نەنیاسم ؟ یان .. یان خەلەتبم ... ئەڤە چ گوتنە ؟ چەوا دێ لێ خەلەتبم ؟ دێ چ بێژمە دەیکا خۆ ؟ .. بێژمێ دێ چمە ناڤ رەزی ؟ ئەز نەشێم بچمە ناڤ رەزی .. رەز ئەڤە ل بەرۆژی .. ئـــەو دێ ل نزاری بیت .. لێ هەر دڤێت ببینم .. هەر دڤێت ببینم ..

ــ ئەو تە چیە تۆ وەکی دینا دگەل خۆ دئاخڤی ؟

ــ ها .. ! تە ئەز بزداندم ..

ــ تۆ هەرا بزدیای ... تە چبـو تۆ دگەل خۆ دئاخفتی .. ؟

ــ ئەز ! چنە .. چنە ...

ــ نەء .. نەء .. بێژە تە چبو ...

ــ من دگۆت ئەڤرو دڤێت بالاڤا خۆ بکەین .. دەستێ منژی شـــڤێدی شویژنەکا ڤێکەڤتی ... نزانم دێ چەوا بالاڤێ کەم ...

ــ شویژن !! چـــەوا شویژن ڤ دەستێ تەکەت ؟ !

ــ ما تۆ شڤێدی نەهاتبویە توبتێ رستنا مالا موختاری ؟ لوێرێ من شویژنەك ل دەستێ خۆدا ...

ــ ئەز نەهاتبوم .. دەیکا من پیچکا نەساخبو ...

ــ دێ کیڤە چی ؟

ــ ما دێ کیڤە چی .. ئەززی دێ وێڤە چم ...

ــ دێ چیە سەر کانیێ ؟

ــ بەلێ ...

هەردو کچك برێڤە دچون ... کراس‌ڤیستانێت وان یێت درێـــژ ل‌بەر پیا دخشیان ... نێزیکـــی کانیکا ئاڤا گوندی بون ... قوربێنا ژنکا ژ کانیێ دەرکەت ... تەڤە تەڤا ئامانا ... بشبشـا ئاڤێ .. کەنیو لیقە لیقـا هندەکـا ... هەردو گەهشتنە سەرکـــانیێ .. گوزکێت خۆ ژ سەر ملێت خـــۆ ئینانەخارێ‌و کرنە د برکا ئاڤێدا .. گوزکێت خۆ شویشتن... هەڤالا وێ رابوو گوزکێ خۆ دا بەر ئاڤا زەلال .. تژی گوزکێ خـــۆ ئاڤ کر .. بـــەرێخـــودا وێ هێشتا یاروینشتیە ئاڤێ ل‌گوزکێ خۆ دکەت .. گازیکرێ ... جلفەك ڤێ‌کەڤت .. راستەرابوڤە ... تا وێکاڤێ دگەل هزرێت وی بو د برکێـــــدا ددبت .. لێ هەکو هـــــەڤالا وێ گازی‌کرێ هزرێت وێ خۆ ژناڤ ئاڤێ ئینانەدەر .. گوزکێ خۆ تژی ئاڤ کر .. دانا سەر ملێ خۆ ... سەر ئەڤراز چوون بۆ مالێت خۆ.. گەهشتنە بەر دەرگەهـــــی‌و بسەر دەرازینکێ کەڤت ... هەمـــی ل دور فـــەرخـــەسێنیـــا زادی دروینشتینە ... مـــاسـتـی‌و سەرتویکی سپیدکر .. دەنگـــێ تێکەڤەدانا چایێ هەر ژ دەرڤە دهاتە گوها ...

ــ باشبو تە بۆ مە ئاڤا تەزی ئینا..

ــ ئەرێ دێ .. وەرە دا هنا‌ڤێت خۆ هێن‌کەین ..

گوزك ژ سەر ملێ خۆ دانا .. ترارکەکێ ئاڤێ تژی‌کر ... گوزك دانا جهێ وی ... هات جهێ خۆ ل‌دور فەرخەسێنیا تێشتێ چیکـر ..نانەکا تەنك یا ئاڤ لێ رەشاندی هەلگرت‌و دانا سەر چوکێ خۆ ..

ــ « یا نوکە ئەو چ دکەت ؟ .. ژ خەو رابویە ؟ نەرابویە ؟ .. ئەز چ دگەل خۆ ببەم ؟ »

ــ تۆ بۆچی تێشتێ ناخۆی ؟ .. کچا من ؟ !

ــ ها .. ! ! دێ خۆم ...

ــ تـــە چیە ... ئـــەڤرۆ تۆ نـــەیا درستی ...

ــ دادێ من هزرا بازندکێ خـــۆ دکر .. هەکو دوهی ئـــەم چوینە بێرێ ل نزاری .. ئـــەز دبێژم ل‌دەڤ وێ کانێکێ کەتیە .. چنکو هەکو ئەم ژبێرێ دزڤرینەڤە .. مە لوێرێ بێهنا خۆ ڤەدابو ئەز دبێژم من یێ هێلایە لوێرێ ...

ــ کچا من ! ! بازنلدو بێرێ ! ! خونە دەهواتە ؟

ــ دادێ مانێ بابێ من ژنویکا بو من ئینابو ...

ــ دێ کچا من چنینە .. هەرێ بەلکی ببینی ...

نانێ خۆ ژ سەر چوکێ خۆ راکرو هاڤێتە ناڤ نانی‌و راست رابوڤەو

بەزی پێلاڤێت خۆ ...
ـ دێ چ کەی کچێ ؟
ـ ها ؟ ! ما تە نەگۆتە من هەرە ل بازندکێ خۆ بکەرێ ؟
ـ ما ڤێ سەرسەرحارێ ؟
ـ دادێ دێ چم هێشتا کـــەس نەچویە وێرێ ....

خۆ ل دەرگەهی داو بۆ سەرنەڤراز بەرێ خۆ دا ئاڤاری .. هەمـــی مالێت گوندی هێلانە لپشت خۆ.. ئـەو مالێت بطلـــێ چیای ڤـــە هاتینەئاڤاکرن .. لسەر کەڤرەکێ بلند راوەستاو بەرێخۆدا گوندی.. گوند دناڤ داروبارارا بـــەرزەبو .. ددنگێ ژ گوندی درەڤی نێزیك ڤ گوه دکەت .. بەرێخودا بەرۆژی .. دیت کەرێ پەزێ گوندی یـێ د کۆشـــا چیایـــێ بەرامبەردا رەش دکەت ... زڤری بەرێخودا گوندی ... چاڤێ رۆژێ دکەتـــە کانیکا گوندیو دزڤری ڤ چاڤێت وێ دکەت ... تشـتەك د دیـــدا مەزن دبو ... نەدزانی کانـــێ چیە ... لێ هەچکو دڤیا هەمی تشـــتا بـــەرسینگێ خۆ ڤـــە نیتو بـــینگێ خۆ ڤە بگڤێشیت .. تژی چاڤا روندکبون .. « هێ .. هێ .. ژین .. تۆ چەندا شرینی » دلێ وێ بترس کەت « نەکو نەهێت ؟ ! بەس پێ گۆتی دێ هێم .. دێ هەر هێت .. دا ئەز بچم بکەهمە نك کانیکێ .. لوێرێ رونم .. تێهنا خۆ بشکێنم ... لەرزکا خـــــۆ بڕەڤینم .. هەکـــو بەژنـــا وی دهەلێت .. دا چاڤێت خـــۆزی بدیتنا چاڤو بەژنا وی کلدەم .. »

ل دور خۆ زڤری .. پشتا خۆ دا گونـــدی ... بـــەرێ خۆ دا سـەرنـەڤرازو چو دا بچتە کالکێ

صباح غالب

# لێکۆلینەوەیەك دەربـــارەی کێشەکـــانی رەخـــنەی ئەدەبـی کوردی

نیاز لەم چەند ووشەیە :

ئەم نووسینە بە گژ هیچ کەسێکدا ناچێو لە رووی چ یەکێکیشدا تیر ناخاتە کەوانەوە ، کە مەبەست ئەوە نەبێ ، دیارە خوێنەری خۆشەویست هەست بەوە دەکات بە گیانێکی هەست بە لێپرسینەوەو دلسۆزی‌یەوە بەرامبەر ئەدەبو زمانی نەتەوەییمان نووسراوە .

کورد دەلێ «دەزگیرانی کەس ناشیرین نی‌یە» ، ئەمە تێروانینێکی زاتی پەتی‌یە بۆ خۆشەویستی شتەکان ، « مەوزوع » گرنگی پێنەدراوە، لەو کاتانەدا زۆربەی کەسو جاران وابووە دەزگیران دزێوی‌و ناشیرینی دەزگیرانەکەی نەبینیوە ، ئەم لێکدابرانەی « زاتو مەوزوع » ە کارێکە لە مێژ سالە وادەی بەسەرچووە ، ئەو پێوانانەی لەو روانگەیەوە دەرچێ لە دنیای ئەدەبو زانستدا چ بایەخێکی‌یان پێنادرێ .

رەنگە بتوانم بلێم منو ووشەی پیرۆزی کوردی « وەك زۆری دیکە » سووکە عەشقی‌یەتێکمان لە نێواندایە ، لای خۆمەوە وا حالیم تا چەند کەمو کەسری‌و ناجوانی لێهەلاوێرم ئەوەندە زیاتر خزمەتی دەکەمو راستەی دلسۆزی‌یەکەمی بۆ دەردەخەم ، بۆیە لێرەداو لە هەموو کاتو شوێنێکدا بەنیازی ئەمەکداری بۆ ئەدەبی کوردی‌و زمانەکەی هەولدەدەم، بە پێی بۆچوونی خۆمو ئاشنایەتیم لە گەل رەخنەی کوردی‌دا چەند خالێکی کەمو کورتی کە بوونەتە کێشەیەکی دروستکراو دیارییان بکەم . ماناو مەبەست لە کاری رەخنەی ئەدەبی‌دا :

ئەمن وا دەزانم دەبێ بۆ سەلماندنی رەسەنێتی رۆشنبیری‌ی کوردو پێشکەوتنی مرۆڤی کورد لە بارەی بیرو هۆشەوە زیاتر تێبکۆشین ، چونکە «ئەدەب بنکەیەکی چەسپاوی ورپاکردنەوەو ئامرازێکی کاریگەرە لە کرداری پێشکەوتنی ئابووری‌و کۆمەلایەتی‌دا » (١) وەك ئەوە بۆ ئەدەب راستو دروستە بۆ رەخنەی ئەدەبیش هەروایە ، جا لەو بارەوە دەبێو پێویستە بە ژیری‌و زانستانە بیر بکەینەوەو پلانێکی گونجاو لە گەل ئاستی کۆمەلایەتی‌و هیواکانماندا نەخشە بکێشین ، هەموو لایەکمان بە قەناعەتەوە وا بزانین «کە رەخنە بە شێوەیەکی گشتی برێتی‌یە لە کاری لێکۆلینەودیەکی هۆشیارانەی رێکوپێك ، باری سەرنجو هەلویست دەردەبرێ ، ئاشکرایە ئەو باری سەرنجەش بە پێی مەوزوعەیەت وەردەگیرێ ، تاوەکوو لە جیهانی جوانکاری‌دا جێگای خۆی بکاتەوە ، لێرەوە وا دەزانرێ پێویست نی‌یە لە « رەخنە » سل بکرێتەوە ، لەبەر ئەوەی لە بنچینەدا کارێکە بە نیازو مەرامێکی پاکەوەیەو ئامانجی بەرەو باشترو جوانکردنە » . (٢)

دیارە نووسینی ئەدەبی گەلێك تێروانین بەرامبەر ژیانو گەردونو مرۆڤ لە گەل خۆیدا هەلدەگرێ ، کەواتە بۆ لێکدانەوە یان رەخنەگرتن لە دەقێکی ئەدەبی چەند رێبازێکی رەخنەیی پێویستە ، بەهیچ کلۆجێ رێبازێکی تاقانەی رەخنەیی نرخی تەواوی بەرهەمەکەمان نادات ، ئەگەریش بۆ هەر لێکۆلینەوەیەکی رەخنەیی تەنیا رێبازێك گیرایەبەر ئەوە بێشك ناتوانێ گشت لایەنە جۆر بە جۆرەکانی بەها ئەدەبی‌یەکە دەربخات ، لەبەر ئەمە ئەمن بەش بە حالی خۆم لە گەل ئەو رەخنە قالب بۆکراوو « تەطبیقی » یە ووشکەدا نیم کە هەر لەسەر زەوقی رەخنەگرو دەستوری دیاری‌کراو لەدایك ببێ،پێشەکی بریاری ئەوە بدات ئەدەب دەبێ وابێو وا بنووسرێ ، بەلکوو دەبێ رەخنە پەیوەندی بە ژیانو تاقی‌کردنەوەکانی مرۆڤایەتی‌یەوە بێ ، باوەرەکانی لە بیرێکی خاوێنو دەرونێکی پاکەوە هەلقولابێتو بە چاکی مەوزوعو لایەنەکانی ژیان بە گشتی بە نەزەر وەربگیرێو لە ژێر ناوی تایبەتی‌و کەسی‌دا نەبێ . بۆیە « لە ناو رەخنەگراندا یەکێك ناتوانێ بلێ من دەتوانم ماناو بەهای هونەری ئەدەبی وەك خۆی دیاری دەکەم » (٣) چونکە تیورە رەخنەیی‌یەکان تیوری پەرتو لایەنگرو خۆیەتینو قابلی دەمەتەقەو تاقی‌کردنەوەن ... مەبەست لەمە ئەوەیە کە بریارو حوکمی رەخنەیی دەربارەی تێکستێکی ئەدەبی بریارێکی سەد دەر سەد تەواو راستو مەقبول نی‌یە لای کۆمەل ... کەواتە هەر حوکمێك کە هەر ردخنەگرێك دەیدا بریارێکی تەقریبی‌یەو نیسبەتێکی راستی تێدایە » (٤)

« لە گەل ئەوەدا کە رەخنەگر هەولێکی زۆر لەبارەی سروشتی کارێکی ئەدەبی‌و ماهی‌یەتەکەیەوە دەداو شی دەکاتەوەو لێی دەدوێ بەلام لە گەلێك جاراندا ناتوانێ هەموو لایەنەکانو ناخی بکرێتەوە ، کاری ئەدەبی کۆمەلەیەکی گرانو بەیەکداچووی بیروباوەرو هەستو سۆزو تاقی‌کردنەوەی ئەدیبە ، ئەگەر موستەحیل نەبێ ئێجگار دژوارە بکەینە هەموو

بەش‌و ناوەرۆکەکەی ، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ کە سروشتی رەخنەی ئەدەبی زیاتر لە هونەرەوە نزیکە نەك لە زانستەوە »(٥) بۆیە خەتاو هەڵەیەکی گەوردیە هێڵی راست‌و چەپ بەسەر نمونەی ئەدەبی‌دا بێنین ، جا ئەگەر ئەوە بە ئارەزوی پەتی‌و بیری نەکامڵەوە کرا ئەوا بێ سێ‌و دوو نووسەری ئەو جۆرە رەخنانە چاك وایە قوتابخانەی پەروەردەیی‌یان بۆ بکرێتەوە ! .

ئەدەب ئامانجە بۆ زیاتر تێگەیشتن لە مرۆڤ‌و لە گەردوون ، بەڵام رەخنەی ئەدەبی مەبەست نی‌یە ، بەڵکوو هۆیە ، تی . ئێس . ئەلیۆت لەو بارەوە دەڵێ « رەخنە خۆی لە خۆیدا مەرام نی‌یە بەڵکوو هۆیە بۆ ئەوەی بە قووڵی لە کاری ئەدەبی بگەین‌و بە چاکترین شێوە چێژو خۆشی لێ وەربگرین »(٦) واتا ئەوەندەی رەخنە لەوەدا سەرکەوتوو بێ چێژو تامی لایەنەکانی دەقی ئەدەبی بە خوێنەران بگەیەنێ ، هێندە لە کاری خۆی نزیك بۆتەوە ، پێچەوانەی ئەمەش لاوازی‌و بێ‌کەڵکی رەخنە پیشان‌دەدات . بۆ ئەمەش ئەم پەڕو ئەو پەری جیهانی دەقە ئەدەبی‌یەکەو ئەدیبەکە پێویستە ، چونکە « وەك رەخنەو لێکۆڵینەوەو نرخاندنی کارێکی ئەدەبی‌یە بەو جۆرەش کارێکی راستەقینەی شارستانی‌یەتە ، کارێکی شۆڕشگێڕانەی پێشکەوتن‌خوازە ، پەیامێکی نەتەوەیی‌و ئینسانی‌یە لەیەك کاتدا »(٧)

**نیگایەکی مێژوویی بەلای رەخنەی کوردی‌دا :**

لە پێش جەنگی یەکەمی جیهانی‌یەوە بزوتنەوەی رەخنەی ئەدەبی لە نێو کورداندا نەبووە ، ئەوەی هەبوو بێ تەنیا برێتی بووە لە رەگەزی رەخنە ، شاعیرانی‌بەر لەو دەمە بە سەر پێی‌یو خێرایی‌وە چەند تاکە بەیتێکیان لە بارەی نرخاندن‌و هەڵسەنگاندنی شیعرەکانی خۆیان یان شاعیرێتی شاعیرێکی دی یان چەند شاعیرێکەوە گوتووە ، ئەگەر بشێ بڵێین ردخنە، ئەوە دیارە ئەو رەگەزی رەخنەیی‌یە بە شیعر بووە نەك بە پەخشان ، چونکە مەسەلەی بەکارهێنانی زمانی پەخشان لە کاری رەخنەی ئەدەبی‌دا دوای شەڕی یەکەم دەست‌پێ‌دەکات ، وەهەر لە دوای ساڵانی «١٩٢٥»ەوە رەخنە لە ئەدەبی کوردی‌دا لە رەگەز دەردەچێ‌و پێ دەنێتە بزوتنەوەیەکی هەست‌پێ‌کراوەوە(٨) لەگەڵ ئەوەشدا کە هەوەڵین جارەو نووسەرەکان شارەزایی‌یان بەسەر رەخنەی جیهانی‌و میللەتانی دراوسێ‌دا نی‌یە بەڵام لە چاو سەردەمی خۆیانەوە بە جوانکاری‌و داهێنان لە قەڵەم دەدرێ ، وەبە حەقیقەت توانیویانە لە بزوتنەوەی ردخنەیی‌دا شتێك بە شتێك بکەن‌و تا رادەیەك بتوانن چێژو بایەخی دەقی ئەدەبی بە خوێنەرانی کورد پێشکەش بکەن .

**لە نێوان رەخنەی کوردی‌و رەخنەی پێشکەوتوودا :**

بە مێژووی ردخنەی پێشکەوتووی هەر نەتەوەیەکی سەر ئەم زەوی‌یەدا بچینەوە روو بە رووی راستی‌یەکی خۆش‌و دڵشادکەر دەبینەوە ، ئەویش ئەوەیە لای هەمووان بزوتنەوەی رەخنە بۆتە مایەی پێشکەوتنی ئەدەب‌و بەرەو پێش‌چوونی بیرو روناك‌کردن‌و فراوان‌کردنی ئاسۆی دوارۆژ ، باری سەرنج‌و وردبوونەوەی ئەدیب‌و خەڵکی لە گەشەو کامڵ‌بووندا خۆیان دەبیننەوە ... ئەگەرچی لە هەندێ شوێنی تەسك‌وکاتی تایبەتی‌دا رەخنەی پێ‌نەگەیشتووی نادروست بەرچاو دەکەوێ بڵاوبوبێتەوە ، بۆ مەبەستی تایبەتی‌و خۆیی نووسراوەو کارە ئەدەبی‌یەکان نرخی راستەقینەیان نەدراوەتێ ، ئەمە هێندە بڕی نەکردووە ، هەر زوو لە بەین چووەو تاوێکی ئەوتۆی نەکردۆتە سەر بۆ دواوە گەڕانەوەی ئەدیب‌و دڵ لە خۆدامانیان ... بەڵام ئەوەی بۆ ئێمەی کورد جێگای داخە مەسەلەی ئیقلیم‌گیری رەخنە لە پێناوی رەخنەدایە . سەرەڕای ئەوەش لەچاو خۆمانەوە ماوەیەکی زۆرە لەو دۆخە تاڵەدا دەژین .

رەخنەی ئێستای کوردی لە رەخنەی ئەورووپای کۆتایی چەرخی نۆزدە – دەچێ ، لەوێ گەلێك رێبازی رەخنەیی هاتنە کایەوە ، هەتا بە جۆرێ «تی . ئێس . ئەلیۆت»ی شاعیرو رەخنەگری ئینگلیزی بە پەشێوی لە قەڵەم دەدات ، لەبەر ئەوەی چەند ردخنەگر هەبوون ئەوەندەش جۆری رێبازی رەخنەیی دروست بووبوون ، هەر یەکە بێ‌پسپۆڕێتی تەواو لە دەلاقەیەکی بچکۆلەوە بۆ ئەدەبی‌یان دەڕوانی‌و گرنگی راستەقینەیان نەدەدایە ، ئەم دیاردەیە لە قوتابخانەی سایکۆلۆجی‌و ئینتیباعی‌دا خۆیان دەبینی‌یەوە . ئەو دوو قوتابخانەیە لە مەبەستە سەرەکی‌یەکەیاندا یەکیان دەگرتەوە ، وایان دەزانی کە ئەدەب دەربڕینی راستەوخۆی کەسایەتی نووسەرە ، لەبەر ئەمە گرووپان لە تایبەتێتی

نووسەر هاڵاندبوو !! وردیان دەکردنەوە !! باتۆرەو نەخۆشی نەفسی خاوەن بەرهەمیان دەردەخست !! هەر ئەمە بووە هۆی کزبوونی رۆڵی ئەو جۆرە قوتابخانە رەخنەیی یانەو دروستبوونی قوتابخانەی نوێی رەخنە ، ئەو رێبازە نوێیەش لەبەر رۆشنایی وەرامدانەوەی ئەم پرسیارانەدا « دەقە ئەدەبی یەکە چی یە ؟ چۆن دروستبووە ، ؟ ئامانجی هونەری نووسەرەکەی چی یە ؟ ویستویەتی چی وەدەستبێنێ؟ ئایا ئەوەی ویستویەتی وەدەستی هێناوە ؟ چۆن ؟ »(٩) .

جا ئەگەر ئێمە پرسیاری « ئایا رەخنەی کوردی تاچەند گەیشتۆتە ئامانجو مەرجەکانی رەخنەی هێناوەتە دی ؟ » بکەین ، ئەوا دوای وردبوونەوەو بیرکردنەوە دەگەینە ئەو باوەڕەی کە لە ئاستی سەردەمو واقیعی خۆماندایە ، هۆشیاری کۆمەڵایەتیو پێشکەوتنی رۆشنبیریو شارستانی یەتمان بێ‌هێزو بێ‌توانایە ، ئەمە وەك ئەوەی بڕیارێکی کۆتایی نی یە ، مەبەستیشمان گشتی یە نەك تایبەتی ؛ لەم باری گشتی رۆشنبیریو هۆشیاریو شارستانی یەدا هەموومان لەسەر ئەوە یەك دەکەوین کە لە خوار ناوەندەوەین ، بۆیە ئێستا دەڵێین رەخنەشمان لە ئاستی ژێر ناوەندەوەیە ، لەگەڵ ئەوەشدا چەند وتارێك یان بڕێك پترمان هەیە کە رەخنەگرەکانیان لە دەروونو بیر و رێبازێکی زانستانەی مەوزوعی رەخنەیی یەوە نووسیویانە .

**نەخۆشی یەکانی رەخنەی ئەدەبی ی کوردی :**

بە حساب گوایا پاکمان لە تەك رێو رەسمی پێشکەوتنخوازانەو بۆپێشەوە بردنی ئەدەبو رەخنەداینو گەرەکمانە لەو رووەوە چیمان لە دەست دێ بیکەین ، بە نووسین بڵاومان کردۆتەوەو لێکدا لێکدا دەی‌ڵێینەوە کە ئێمە رۆڵەی چاکەکاریو کردەوەی باشین ، نەك هەر ئەمە لە هەندێ جاردا دروشمی « وتەی چاك ، بیری چاك ، کردەوەی چاك »یشمان بەرزکردۆتەوە . بەڵام ئەوەمان وەك جێ‌بەجێ نەکردووە ، تەواو پێچەوانەشی جولاوینەوە، ئەم زیادە رۆینە لە هەڵویستی ئاوەژووی رەخنەدا وای لێ‌کردوین خەریکین ببین بەوانەی لە قسەو کردەوەدا بەرەو رووی خۆمان ببینەوەو هەر خۆمان بەس بین بۆ ئەوەی بە ڕووی خۆماندا بچینەوە .

دەمێکەو بە تایبەتی لەم رۆژانەدا کەمتر وا بووە ئەوانەی بەکاری رەخنەی ئەدەبی یەوە خەریکن بیرو هۆشو ئەندامانی هەستیان وەك پێویست جوانو دزێو ، چاكو خراپ ، تاڵو شیرین ، نەرمو رەق ، ئاوازێکی دلگیرو نەوایەکی دڵتەزێن هەڵاوێرن ، کە جوداکردنەوەی ئەوانە بۆ خۆیان لە بەرزەوەندی کوردو بەرەی مرۆڤو مرۆڤایەتی یە ، لەبەر ئەوەی دیاری‌کردنی هەموو شتێك وەك هەیە پێویستی یەکی فیکریو ژیریو دەسەڵاتی وزەو توانستە ، تاوەکو تێك‌چڕژانێکی نادروست پێك‌نەیەتو ئەم سەرو ئەو سەری بووەکان لنگەو قوچ نەبنەوە .

ئێستا ئەو نووسینانەی لە رۆژنامەو گۆڤاردکانداو جار جارەش لە شێوەی نامیلکەو کتێبۆلکەدا بە ناوی رەخنەوە بڵاو دەبنەوە یان بۆ دۆستایەتیو هەڵدانە یان بۆ شکاندنو لێدانە ، کە هەردووکیان لە بایەخی رەخنەو پایەی رەخنەگر دێننە خوارەوە ؛ بە تایبەتیو بە گشتی کۆمەڵێك دەردیان بۆ رەخنەی ئەدەبی دروست کردووە ، وا لەو چەند دێرەی بەرەوەدا کەمێکیان لێوە باس دەکەین :

**یەکەم ـ نەبوونی پرۆگرام : ـ**

پروگرام برێتی یە لەو رێبازەی رەخنەگر بۆ روونکردنەوەو نرخاندنی دەقی ئەدەبی دەی‌گرێتەبەر، نەبوونی پروگرام هەموو کارێك بێ‌ئەنجامو ناکامی زانستانە دەهێلێتەوە ، ناوەندێتی « المرکزیە » ناهێڵێو بیرەکان بە شێواویو نادروستی بەجێ‌دێڵێ، نامەرکەزیەتو شتی تایبەتی خۆی دەسەپێنێو پێوانەی کردارەکە دەبێتە سەرنجی زاتی رووتو بڕیاری پێشەکی ؛ « گەورەترین ناتەواویش لە رەخنەی ئەدەبی دا ئەوەیە کە نەزانرێ چۆن کارە رەخنەیی یەکە ئەنجام دەدرێ »(١٠) .

ئەو رەخنانەی هەن زۆربەیان لەسەر رێبازی زەوقی سەر پێ یی و هەڕەمەیین ، چونکە ڕەخنەگر وا نازانێ بۆ رەخنەی سەرکەوتووی بەبڕشت پێویستی بە ئیستاتیکاو دەروون شوناسیو شارەزایی ژیاننامەی ئەدیبەکەو زۆری دیکە هەیە، لەوەشەوە دەمار توندی کەسایەتی خۆی تێدا زاڵ دەکاو بایەخ بە لایەنە

جوانەکانی بەرهەمە ئەدەبی‌یەکە نادرێ ، لە کاتێکدا مەرجە گرنگی بە مەوزوعی‌یەت‌و خۆیەتی هونەرو ئەدەب بدرێ ، تاوەکو چێژی ژیرانەو هەست‌و زەوقی هۆشیارانە لە پارچە ئەدەبی‌یەکە بکرێ .

**دووەم ـ نەشارەزایی لە بەکارهێنانی زاراوە رەخنەیی‌یەکاندا : ـ**

بە قوولی تێنەگەیشتن لە ماناو کاکلەی هەر ئیدیومەیەکی رەخنەیی دەبێتە مایەی خراپ بەکارهێنانی ، ئێمە ئێستاش وا بیر دەکەینەوە کە گوتن‌و نووسینی چەند وشەو زاراوەیەك با لە جێی خۆشیاندا نەبن ـ نیشانەی رۆشنبیری‌و خۆبەشت‌زانینە ، ئەوی راستی‌بێ هیچ یەکێك لەو خەلکە ئەوەندە زانا نی‌یە گشت شتێك بزانێ ، کەم شتیش هەیە لەوە خۆشتر بێ مرۆڤ بزانێ چەند دەزانێ‌و سنووری شارەزایی خۆی لا ئاشکرابێ ، ئەوەی ئاگاداری خۆی نەبێ‌و وابزانێ بە قەدەر گەورەیی جیهانی ئەدەب‌و زانست زلە ، ئەوا تا زووە بای‌داتەوە بۆ سەرەتایەکی سادەو دەست‌پێ‌کردنەوە ، دەنا خۆشی لەدەست دەچێ‌و وەك « کوردەی لە هەردوو جەژن بووی » لێ بە سەر دێ .

ئەگەر رەخنەگر لە قەناعەتێکی تەواوەوە ئاگاداری موستەلەحە رەخنەیی‌کان بێ هەرگیز رێگا بە قەلەمەکەی نادات بنووسێ: فلانەکەس چیرۆکنووس یان شاعیر نی‌یە ! یان فلانە کتێب هیچی تێدانی‌یەو خاوەنەکەی هەر ماندوێتی بۆ ماوەتەوە ! یان ... ! یان ... ! ! .

ئەو زاراوانەی کە لە رەخنەی کوردی‌دا بە نەکاملی‌و بێ‌وەختی ناویان دێ زۆرن ، ئێمە رەنگە بەهەلەدا نەچووبین ئەمانەی خوارەوە بە نموونە بنووسینەوە : قوتابخانەی گۆران چی‌یە ؟ قوتابی‌یەکانی کێن ؟ گۆران چ داهێنانێکی هێناوەتە ئەدەبی کوردی‌یەوە ؟ مەسەلەی کلاسیکی‌و رۆمانتیکی؟ ئایا دوا شاعیری کلاسیکی هەیەو کێ‌یە ؟ ! (١١) ئەدەبی جەماوەر چی دەگەیەنێ ؟ شێوە ، ناوەڕۆك چین ؟ فرۆیدی ؟ ئەدەبی ناماقوڵ ، فۆتۆگرافی ، سروشتی ، سریالی ، دادایی ، ریالیزم ، ریالیزمی سۆشیالیستی ، ریالیزمی نەتەوەیی ؟ ... زۆری دیکە .

**سێیەم ـ دواکەوتنی رۆشنبیری :**

رۆشنبیری کۆمەلێك زانیاری‌یە لە رێگایەوە مەلەکەی بیر دەولەمەند دەبێ‌و بەرز دەبێتەوە ، هۆش پێ‌دەگاو گەشە دەکات ، ئەمەش لە زۆر رێگاوە چنگ دەکەوێ ، وەك خوێندنەوە ، گەشت‌و گەڕان ، تێکەڵی ، تاقی‌کردنەوەی رۆژگار ، فێربوون ...

نزمی ئاستی رۆشنبیری زۆری لەوانەی بە پرۆسیسی رەخنەوە خەریکن هۆیەکی گرنگ‌و مەزنە بۆ دواکەوتنی رەخنە ، لە نزیکەوە ئاگایان لە کەلەپوری رەخنەی کوردی نی‌یە ، خەرمانی مێژووی رەخنەی جیهانی‌و پراکتیکی لێکۆڵینەوەی نوێ‌یان لا شاراوەیە ، بە مانایەکی دی باگەراوەندێکی رۆشنبیری مێژوویی‌یان نی‌یەو لە واقیعی ئەدەبی رابوردووش‌و ئێستاش دابڕاون، هەر لەتەك ئەمەدا ئەدیبە کوردەکان بە گشتی‌و رەخنەگرەکان بە تایبەتی لە خوار ئاستی هەست بە لێپرسینەوەو ویژدانی ئەدەبی‌یەوە دەبینرێن ، هەر یەکەیان زیاتر لە بازنەیەکی نیمچە داخراودا دەخولێنەوە ، ئەوەندی لەو سنوورەش دێنە دەرەوە بەس نی‌یە بۆ ئەوەی هەست بە راستی‌و واقیع بکەن ، بۆیە هەرکەسەو لای خۆیەوە وا بانگاشە دەکات کە بە هەموو گەورەیی‌و مەزنی‌و جوانی‌یەك گەیشتووە ، بەلام لە حەقیقەتدا هێشتا زۆریان ماویانە .

دواکەوتنی رۆشنبیری کارێکی دیکەی وای‌کردووە کە رەخنە نووسەکان تووشی نێرگزی‌یەت ببن‌و لە گەڵ ئەدیب‌و خەلکیدا بۆشایی‌یەکی (١٢) فراوانیان بکەوێتە نێوانەوە ، چی‌یان دەوێ بەسەر بەرهەمی ئەدەبی‌دا بسەپێنن .. لە کاتێکدا رەخنەگر باوەڕەکانی ئەدیب بە روونی‌و ئاشکراکردنیان پێشکەش دەکاتەوە ، دەکرێ داوا لە ئەدیب بکات کە پێویستە دڵسۆز بێ‌و باوەڕو هەڵویستی رۆژانەی یەك‌بگرنەوە ، بەلام رەوای حەق نی‌یە رێبازی فەلسەفی‌و چۆنیەتی نووسینی بۆ دابنرێ ، کەواتە ئاسایی‌یە رەخنەگرو ئەدیب لە باوەڕدا یەك نەگرنەوە ، بەلام مەسەلەی ئەخلاقی‌یەتی ئەدەب‌و رەخنە لەوە پیرۆزو گەورە ترە قسەلۆك‌و وتەی ناشیرین بکەوێتە نێوانیانەوە ، ئەمەی دوایی‌یان کەوا بمێنێتەوە کارەساتێکی گەورەیەو مەترسی زیاتر لە شوێن دەبێ .

**چوارهەم ـ کەمی پسپۆڕو شارەزایانی رەخنە :**

بۆ هەر کارو بارێکو بۆ ئەنجامدانی هەموو فەرمانو ئیشێك ، مرۆڤی لێهاتووی کارامەو لێزانی دەوێ،کە وردبینو ئاگاداری هەموو لایەنەی ئەرکەکەی سەرشانی بێ ، ئەوانە لە مەیدانی ئیشەکانیاندا پسپۆڕیان پێدەڵێن ، شارەزایانی رەخنەش لەو جۆرە کەسانەنو لە بواری خۆیاندا قەڵەمەکانیان هەڵدەسوڕێنن .

ئێمەی کورد لە چەند کەسێك زیاتر لەو چەشنە رەخنەگرانەمان نییە ، کەچی لە رەخنەی رۆژانەی سەر لاپەڕەکاندا دەیان ناو بە ناوی رەخنەگرەوە نووسین بڵاو دەکەنەوە . بێگومان ئەوانە هیچیان هەڵو مەرجی پسپۆڕییان لە کرداری رەخنەییدا نییەو بۆ ئەوە ناشێن خۆیان لە ئیشی خەڵکی دیکەدا هەڵقورتێنن .

جوداکردنەوەی گروپی رەخنەگرانو نووسەرانی دی کە رەخنەگر نین یەکەم دەردوو بۆ خوێندەواری زیرەك دەردەکەوێ ، ئەوەی لەو جیاوازییەشدا رۆڵی سەرەکی دەبینێ ئسلوبی نووسینەکانیانە ... ئاشکرایە ئسلوب یەکێکە لە رواڵەتەکانی کەسایەتی نووسەر ، لەو بارەوە رەخنەگری فەرەنسی سانت بیفن دەڵێ « هەموو نووسەرێك ئسلوبێکی هەیە ، تایبەتێتی خۆی پێوەیەو لە ئسلوبی ئەدیبێکی دی ناچێ » .

زۆر چیرۆکنووسو شاعیری کورد وا دەزانن لە پاڵ پیشەکەیانەوە رەخنەگرێکی چاکیشن ، جا چی پێرا گەیشتن چیرۆك بێ یان شیعر یان رەخنە دەنووسن ، لە ئاکامیشدا ئەگەر لە چیرۆکەکان یان شیعرەکانیاندا سەرکەوتوو بن ئەوا لە نووسینە رەخنە ئامێزییەکانیاندا جگە لە مەبەستی تایبەتی مەبەستی زانستانەی رەخنە ناپێکن .

لە ئەوروپادا شاعیری گەورەی تێداهەڵکەوتووە، لەهەمان کاتدا رەخنەگری گەورەش بوون ، وەك ئەلیۆتو ئەزرا پاوندند ، چونکە باوەڕی تایبەتییان بەرامبەر بزووتنەوەی ئەدەبیو تازەگەرێتیو کەلەپوورو زمانو تەکنیکی شیعرو لێکۆڵینەوەی بەرهەمی ئەدەبی هەبووە ، لەو لایەنەشەوە نووسینی زۆریان بڵاوکردۆتەوەو هەوڵیان بۆ داوە ، هەتا ئێستاش بۆچوونە رەخنەییەکانیان لەزانستگاو ئەکادیمییەکانی جیهاندا قبوڵکراونو بە دەرس دەگوترێنەوە .

پێموایە رەنگە حەف بێ کە نەکرێ ئەوانو ئەمانەی خۆمان بەراورد بکرێنو یەك حسابیان بۆ بکرێ ؟ ! .

ئەمن وا بیر دەکەمەوە بۆ کاری رەخنە بەهرەی زاتی پێویستە ، بەڵام ئەمە وا ناگەیەنێ کە مەسەلەی رەخنە بە بەهرەی رووتو پەتی بزانین ، چونکە وەك بەهرە تاوی سنوورداری هەیە، پراکتیكو مەشقکردن لەسەر رەخنەو تاقیکردنەوە لەو بوارەدا زیاتر رەخنەگری گەورەو لێهاتوو دروستدەکات ، بەڵام لای رەخنەگرانی کورد بۆتە غەریزە ، لە بەر ئەوەی گەلێکیان بێگوێدانە مەشقو پراکتیك لە رەخنەدا ، بێئەوەی ئامانجێکی پیرۆز لە پێش بگرن قەڵەم دەخەنە سەر کاغەزو بە ناوی رەخنەوە نووسین بڵاودەکەنەوە .

**پێنجەم ـ نزمی ورەو لاوازی کەسایەتی :**

لە دنیای دەروون شوناسیدا وابڵاوە کە کەسایەتی مرۆڤ بریتییە « لە یەکێتی کۆمەڵێ سفاتی تا رادەیەك چەسپاو کە یەکێك لە یەکێکی دی جودا دەکاتەوە ، لەوانە سفاتی لاشەییو ژیریو کۆمەڵایەتیو مەزاجیو رەوشتی »(١٣) مانای ئەمە وا دەگەیەنێ کە دەبێ کردەوەکانی دەردوە لە گەڵ ناخو ویستی راستەقینەی مرۆڤەکەدا لە زۆربەی کاتو شوێندا یەك بگرنەوە ، جا ئەگەر کەسێك دیوی دەرەوەو ناوەوەی جووت نەبوونو خراپەی پترو چاکەی کەمتر لە هاندا دەورو بەریکرد ، ئەوا نیشانەی لاوازیو بچووکی کەسایەتییەتی .

هەموو یەکێك خۆشیو کەیفی بە تاریفو پێداگوتن دێ ، بەڵام کە بۆ هەمیشەییو بەردەوامی لە یەکێکدا هەبوو دەبێتە مایەی بەتاڵیو فیزی خۆ بە زلزانین .. بە داخەوە .. زۆر بە داخەوە دەردی دوکتۆر عەلی جەواد تایەر دەڵێ «نووسەری ئێمە لە سەرەتاوە تا کۆتایی هەر ستایشو پێداهەڵدانی دەوێ . ئەگەر ئەوە نەبینێ هەوڵی ئەوە دەدات رەخنەگر بریندار بکاو لە نرخی کەم بکاتەوە »(١٤) .

چاکترین بەڵگەش ئەوەیە کە تا ئەمڕۆ یەکێك شکنابەین گچکەترین نووسینی لە سەر نووسرابێ ، بە توورەییو هێرشەوە وەرامی نەدابێتەوە ، بێگومان لە سەدا «٩٥» نەوەتو پێنجی پێویستیان بە لە

سەر ڕۆشتن‌و وەرام دانەوە ناکەن .

وێنەیەکی دیکەی پەیوەندی بە لاوازی کەسایەتی‌یەوە هەیە ئەوەیە ، ئەوانەی بەناوی ڕەخنەوە شتێك دەنووسن ، دەچنە سەر کاربەدەستان‌و لێپرسراوانی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان تا بەرهەمە لە ئەدەب‌و ڕەخنە بەددرەکانیان بۆ بلاوبکەنەوە . لە ڕاستەقینەدا بەرەو پیرچوونی ئەوانەو بە قسەکردنیان گێژاوی « کێ بە کێ‌یە » دروست دەکاو بۆ بەرژەوەندی ئەدەب‌و ڕەخنەی کوردی ناگەڕێتەوە ، لە ئەنجامیشدا برایانی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان پریشکی گلەیی ئەدەبی‌و مێژوویی‌و نەتەوەیی‌یان بەر دەکەوێ .

ئەو کەسەی بە ناوی خەلکی دیکەوە «مستعار» ڕەخنەی نادروست بلاودەکاتەوە ، بەلای ئێمەوە دەکەوێتە ژێر ئەم سەرباسی بێ‌شەخسی‌یەتی‌یەوە .. بۆیە بەو جۆرەش بیر دەکەینەوە دیارە بیانوویەکی قەناعەت پێکراوی لەو ڕووەوە نی‌یە جگە لە تانەو کەم کردنەودی خەلکی .

## شەشەم ـ دابەشکردنی خوێنەرانی کورد بە چەند بەرەیەکەوە :

مەسەلەی دووبەرکی لە نووسین‌و ڕەخنەدا تاوی نەگونجاوی بۆ سەر خوێنەران هەیە ، وەك چۆن ڕەخنەگران‌و ئەدیبان سەد حەیف‌و موخابین ناتەباو لێك دوورن خوێنەرانیش بەو شێوە لە یەکدی دابراون ، هەولی ئەوە دەدرێ هەر لایەو بە پەروەردەیەکی سەفسەتایی گوش بکرێن‌و سەنگ‌و تەرازووی کێشانی ڕاستی‌و پاکی‌و دادپەروەری‌و جوانی نەمێنێ‌و کەم کەس لە سەر شتێك پێکەوە ڕێك‌بکەون ... ئەمە کارێکی وای‌کردووە نەهێلن خوێنەران چێژ وەربگرن‌و خاوەنی دەنگی خۆیان بن لە لایەك ؛ لە لایەکی دیکەوە کۆمەلێك خەلکی ئەدەب دۆست هەن سەرتاپا باوەڕیان بە ڕەخنەی ئەدەب‌و لەق بووە ، لەبەر ئەوەی دەبینن خاوەنی نووسینەکان کەمتر پەرۆشی‌ی دلسۆزی‌یان بۆ وشەی پیرۆزو نەبەزی کوردی هەیە ... خەلکەکە دەپرسێ کەوا نی‌یە بۆ !!؟؟ دەشێ دلسۆزەکان یەك‌نەگرن‌و بەگژ یەکدا بچن !!؟؟ دەکرێ دەستەیەکی هۆشیارو ڕۆشنبیر کاری نادروستیان لێ‌بگیرنەوە !! ؟؟ ... !! ؟؟ ... ؟؟ !! ... هتد .

## چارەی ئەم دیاردەیە :

بۆ ئەوەی ڕەخنەی کوردی ببێتە بزووتنەوەیەکی تەواوی سەردەم‌و تەعبیر لە پێشکەوتنی فکری‌و شارستانی‌یەت‌و چۆنیەتی تێڕوانینی مرۆڤی کورد بەرامبەر گەردوون‌و مرۆڤ بداتەوە ، پێویستە کاکە ڕەخنەگرەکان لە گەل برا ئەدیبەکاندا شارەزایی‌یان لە ڕێڕەوی بەردوپێشەوە چوونی ئەدەب‌و ڕەخنەی خۆمالی‌و دراوسێکان‌و بێگانەدا هەبێ ... لە پال ئەمەشەوە باری ئابووری‌و دەروونی‌و سیاسی‌و ڕۆشنبیری‌و مێژوویی نەتەوەیمان مەرجە بە نەزەر وەربگیرێ ، لەپێش هەموو شتێکیشدا ئەوە لەبەرچاو دابنرێ کە دەبێ نووسینی ڕەخنەیی هەمووی ڕەوشت بەرزی‌و بیری هۆشیارانەو ڕێبازی فێربوون‌و ئاراستەکردن بێ ، هەتا زیاتر گرنگی بەم لایەنە بدرێ چاکترو زووتر ئێمە بەرەو ئاسۆیەکی ڕوناکتر هەنگاو هەلدەگرین . چونکی هەرپێشکەوتنێکی تەکنیکی‌و شارستانی‌یەت ، بێ‌ڕەوشت ، خۆی لە خۆیدا مایە پووچی‌و تێنەگەیشتنە لە زات‌و لە مەوزوع .

پەیلمی ئەدەبی‌و ڕەخنەیی‌و ڕۆژنامەنووسی لەوە گەورەترن شیعر بۆ سووکی یەکێك‌و ڕەخنە بۆ ڕووت‌کردنەوەو داشۆرینی کەسێك لە ڕۆژنامەدا یان گۆڤارێکدا چاپ‌بکرێن ، با مەسەلەی دۆستایەتی ، ناحەق نەکات بەحەق‌و دزێو نەکات بە جوان‌و بەپێچەوانەوە ... بلاونەکردنەوەی نووسینی لەو بابەتانە یەکێکە لە ڕێگا چاکەکانی چارەسەری ئەم ئێش‌و ئازارە ... با ڕێگاش نەدرێ بە ناوی «مستعار»ەوە پاشقول بگیرێ ، خۆ ئەگەر نارەخنەگرەکان بە تەواوی دوورکەوتنەوە ئەوا دەروازەیەکی گەورەی ئاسۆ ڕوونی دەردەکەوێ .

## ئاکام :

ئێمە پێویستمان بە ڕێبازی ڕەخنەی پێشکەوتن‌خوازانەی کوردی هەیە کە لە کەلتووری ڕەخنەو ڕەوشتی کوردەواری‌و ڕەخنەی جیهانی سەردەمەوە سەرچاوە هەلبگرێ ، بۆ ئەوەش دەبێ یەکێتی دەروون‌و نیازو مەبەست‌و ڕاستگۆییمان تێدابێ ، تاوەکو وەچەکانمان دلیان خۆش بێ‌و لە دواڕۆژدا سەرزەنشتمان نەکەن .

ئیکە با هەر شەکاوە بێ ئالای وشەی پرشنگدارو پیرۆزی کوردی . ◁

سەرکەوتن و گەورەیی بۆ مرۆڤی راستەقینە بە ئاوات دەخوازم .

## پەراوێزو سەرچاوەکان :


(١) الاقلام ، العدد العاشر ، السنه الثانيه عشره ، تموز ـ ١٩٧٧ ، ص٤٦ .

(٢) نواف ابو الهيجاء ، لا خوف من النقد ، جريدة الثوره ، العدد ـ ٣١٤٠ ، ١٨ـ١٠ـ١٩٧٨ .

(٣) مجله عالم الفكر ، المجلد التاسع ، العدد الثاني ، يوليو ـ اغسطس ، سبتمبر ١٩٧٨ ، ص٥ .

(٤) هەر ئەو سەرچاوەو لاپەڕە .

(٥) هەر ئەو سەرچاوەیە لاپەڕە /٦ .

(٦) هەر ئەو سەرچاوەیە ، ل /٥ .

(٧) مجله الكلمه ، العدد الثالث ، السنه الخامسه ، ايار ـ ١٩٧٣ ص١٠٥ .

(٨) ئەمە بۆ خۆی باسێکی کەمێ دەولەمەندەو خودا بکا لە هەلێکدا شتێکی لێ بلاو دەکەینەوە .

(٩) الدكتور رشاد رشدي ، النقد والنقد الادبي ، دار العوده ، بيروت ١٩٧١ ، ص٩٠ .

(١٠) الن تيت ، ترجمة الدكتور عبدالرحمن ياغي ، دراسات في النقد ، منشورات مكتبة المعارف ، بيروت ، ١٦١ ، ص٩ .

(١١) تائێستا سێ باوەڕی جیاواز دەربارەی دواشاعیری کلاسیکی لە ئەدەبی کوردیدا بلاوبوونەتەوە ، یەکیان بێخود ، دووەمیان فانیو سێهەمیان عەلی کەمال باپیر بە دوا شاعیری کلاسیکی دەزانن ، ئەمە لێکۆلینەوەیەکی سەربەخۆی دەوێ کە ڕەنگە باوەڕێکی نوێتر لەوانە بێتە کایەوە .

(١٢) مەبەست بۆشایی پەروەردەی کۆمەلایەتییە نەك جیاوازی بیروباوەڕ کە ئاساییە .

(١٣) الدكتور عبدالرحمن القيسي والدكتور حمد دلي الكربولي والسيده اميمه علي خان ، علم الطفل ، الطبعه السابعه ، مطبعه وزاره التربيه ، بغداد ، ص١٥٧ .

(١٤) مجله الف باء ، العدد ٥٢٥ ، السنه الحاديه عشره ، ١١ تشرين الاول ١٩٧٨ ، ص٤٧ .


## چیرۆك



بۆ جاری دەیەم ژوورەکەی رێك خستەوە ، کتێبەکانی لەسەر مێزەکە ریز کردو لە سوچێکدا دانا ، بیرو هۆشی هەر لای دەرگاکە وەبوو ، چاوەڕێی ئەوەی بوو بە پەنجە ناسکەکانی تەقە لە دەرگاوە هەلستێنێ ، چووە لای پەنجەرەکەوە ، تەماشایەکی خوارەوەی کرد ، شەقامەکە جمەی دەهات « ئێستە حەز دەکەم هەموویان لەباوەش بگرم .. چۆن ئەو ماوە درێژە توانیم بەسەر بەرم .. تەنهایی و بێزاری ، چۆن وەك مۆرانە نەیان خواردم » تەقەی دەرگاکە نەیهێشت لەوە زیاتر بۆ ناو بیرەوەرییەکانی شۆڕبێتەوە . تەکانیدا دەرگاکە بکاتەوە فریانەکەوت ، بەر لەئەم دەرگاکەی کردەوەو هاتەژوورەوە ، چەپکێ گولی بە دەستەوەبوو ، ژوورەکەی بووە باغچەیەکی سەوز ، چەپکە گولەکەی لەسەر مێزدکە داناو لەسەر ئەسکەملییەکە دانیشت.

ـ ئیتر ناهێلم لێم دوور کەویتەوە .

ـ باشە ئەو ماوەیە چۆن گوزەرانت دەکرد ؟! .

وەرامەکەی ئەو ڕۆژەی بیر خستەوە ، کە دوو بەدوو بە شەقامەکەدا شۆڕبوونەرە ، ئەو کاتە حەزی دەکرد جارێکی تریش دووبارەی بکاتەوە هەر ئەو

کاتەش لە دلی خوی‌دا ووتی « کەس ئەم پرسیارەی لێ نەکردووم‌و وا بە تەنکمەوە نەهاتووە »

ـ بەردە رەش هەلکەڕاوەکەو گۆلە بچکۆلەکەی قەراغ رووبارەکەت لە یادە ؟ سەرەتای پایز بوو لە قەراغ رووبارەکەوە بێ دەنگ دەیانڕوانی‌یە زەردەپەڕ ، پەری بەردێکی رەش هەلکەڕاوی بیشان‌داو بە ئاسەم لە جێکاکەی خۆیەوە گوازتی‌یەوە تەنیشت بەردە لووسەکانی نێو ئاوە تەنکەکەوە ، کاتێ هەلسان بەردەکەی پێشان دایەوە وەکو پێشووی نەبوو . رۆژێکی کەش لە دور لاوە دوو جۆگەلەی باریکیان بۆ گۆلێکی بچکۆلەی تەوزە گرتوو بەدەست هەلکەند ، پاش ماوەیەك ئاوی گۆلەکە روون بووەوە .

ـ لە بیرمە . بەلێ لە بیرمە .

ـ دەباشە . بۆ ئەوەی بیسەلێنی کە هەی ، دەبێ بەشداری ژیان بکەی . ئەگینا وەك بەردەکەو گۆلە بچکۆلەکە . . . . .

ووتەکەی تەواو نەکرد ، بەلام بەپێکەنینێکی مانادار مەبەستەکەی تێ‌گەیاند . هە لسا چەپکە گولەکەی بۆ هێنا .

ـ ئەمەیان لە گولدانێکدا لە تەنیشت وێنەی ناو چوارچێوەکەوە دانی ، سبەینێش سەرو گول دددەینە دەستی ئەوانی ترەوە . لە دەرگاکەدا وەستا تاکو تەقەی پێی تێکەل بە دەنگە دەنگی شەقامەکە بوو . دەرگاکەی پێوەدا ، یەك دوو جار سوڕی بۆی‌دا، هەناسەیەکی قوولی هەلکێشا ، ووتەکانی ، پێکەنینەکانی لە مێشکیدا دەنگیان دەدایەوە ، بۆ ماوەیەك بیری لەم ژیانە تازەیەی دەکردەوە .. وا ، شەو نیوەی زیاتری بەسەرچووە ، شەقامی ژێر ددم ژوورەکەی بانگەوازی وردەفرۆش‌و گوڕەی ئۆتۆمبیل‌و ژاوەژاوی هات‌و چۆکەرانی لێ‌بڕاوە ، هەندێ جار نەبێ فیکەی حەسحەسێك بە تەقەی بزماری ژێر پۆستالەکەی ، بێ دەنگی‌یەکەی وریا دەکردەوە ، ئەو شەوانەی پێشووی کە جارێ هێشتا پەری نە ئەدنسی، لەم کاتانەدا ئۆقرەی لێ هەلدەگیرا ، بنمیچەکە نەوی دەبوو ، ناچار خەمەکانی دەگردە کۆلەوەو شەقامە چۆلەکانی دەگرتەبەر ، شەو کۆتایی نەدەهات ، نەبووە مێردە زمە کانیش لە جوولە دەکەوتن . چوو بەلای پەنجەرەکەوە ، تەماشای خوارەوەی کرد ، شەقامەکە بێ دەنگ وەك ئەژدیها کشابوو گوێی لە شار دەتەکان، نمە بارانێك رەشتر هەلێگیرابوو لەبەر خۆیەوە ووتی « گەلێ جار دەمویست خۆم لێرەوە گلۆر بکەمەوە » ، لەبەر خۆیەوە بە دەنگێکی نزم گۆرانی‌یەکی سەردەمی منالی دووبارە کردەوە ، ئەو گۆرانی‌یەیە کە کاتێ خەلکی گوندەکەیان ئێواران لە دروێنە دەگەڕانەوە لاوەکان سەرەرای ماندویەتی‌یان دەستیان دەنایە بنا گوێ‌یان‌و بەسەر گوندەکەدا دەیان چڕیکان هەوالی گەڕانەوەیان بە دەزگیرانەکانیان رادەگەیاند کە ئەو کاتەلە ناو ڕاندا مەڕیان دەدۆشی یا بە گۆزە ئاوەوە لەسەر جۆگەلەکە دەگەڕانەوە . بیری کەوتەوە کە دەمێکە گۆرانی نەووتووە . پەنجەرەکەی پێوەدا ، رووی وەرچەرخان بۆ ناو ژوورەکەی ، سەرنجی لە ئەسکەملی‌یەکە گیربوو کە ماوەیەك لە مەوبەر پەری لەسەری دانشتبوو ، ئەسکەملی‌یەکە بووە باخچەیەك ، گولێکی گەشاوەشی لەسەر دەرکەوت ، حەزی دەکرد دیمەنەکە لەبەر چاوی قەت نەسڕێتەوە . هەر دوو دەستی لە دیوارەکە توند کردو خۆی‌دا بە سەریانا .

« خۆزی کۆچەری هاورێم زوو تر پێتی دەناساندم خۆزی »

لەناو بێ دەنگی‌کەوە ئەو رۆژەی بەیەك گەیشتن، سەری هەلداو قووت بوەوە :

ئێوارەیەکی پایزبوو لەگەل کۆچەردا سەرو رۆژنامەیان بەدەستەوە بوو کاتێ کۆچەر لەدواوە شانی گرت پێکەوە بینبیانی .

ـ چی‌یە دەلێی شتێکت لێ‌وون بووەو بە دوایا دەگەرێی ؟ . هەر کە چاوم پێی کەوت ویستم بلێم « ئەوەی بە دوایا دەگەڕێم ئەمەیەو وا دۆزیمەوە » بەلام نەمتوانی بیلێم تەنها پێکەنینێکی پچر پچرم دا بە گوێ‌یاندا ، باش بوو کۆچەر فریای کەوتم .

ـ پەری .. پەری کریم .

دەستی لەناو دەستما بۆ ماوەیەك ئارامی گرت ، موچرکێك لەشی داگرتم ، چاوە کالەکانیشی نمە بارانێك بوون بە سەرما دایاندا . بۆ یەکەم جار ئەوشەوە بنمیچی ژوورەکەم نەوی نەبوو تابەیانیش خەونی خۆشم بینی . بۆ رۆژی داهاتور بە تەنها بینیمەوە ، پێکەوە بە شەقامەکەدا شۆڕ بووینەوە . حەزم ددکرد شەقامەکە درێژ بێتەوەو کۆتایی‌ی نەیەت .

ـ ئێ باسی خۆتم بۆبکە .

ـ هەر لە منالی‌یەوە گڕەی گەرمەسێر برژاندمی هەست دەکەم یەکەم جارە بۆنی بەهار هەلدەمژم .



- من دەڵێم باسی خۆتم بۆبکە .

ـ لە دوورگەیەکی چۆڵام تۆ ئەو بە لەمە بچکۆلەیەی بەردو ئاوەدانیم دەبەی .

ـ ئێرەت پێ خۆشە ؟

ـ هەست دەکەم دوو جار لە دایك بووم جاری دووەم لەوێوە دەست پێدەکات کە تۆم ناسی .

ـ کۆجەر باسی بێدەنگیو تەنیاییو بێزاری تۆی زۆر بۆ کردووم ... یەکێکی تر هە ...

گوڵی سەر ئەسکەملییەکە تەمێك دایپۆشی . تەمەکە بووە گەردەلوولێكو فڕێی دایە رووبارێکی ترەوە بەرەو رۆژانی منالی ملی پێی نا ، لەو رۆژانەوە تا ئەم ساتانەی رێگایەکی درێژو تاریکە ، ئەگەر پەڵە رۆشناییشی تیاندا هەبێ کاڵن‌و بۆی لە یەك جیا ناکرێنەوە . وەك تازە پێی گرتبێ بەرەو ئەسکەملییەکە هەنگاوی‌نا تا بەرامبەر وێنەی ناو چوارچێودکە پێی درێژکرد «ئەمە ئەو یەکەیە کە تۆ مەبەستت بوو . کە دواجا بەدرێژی بۆتم گێرایەوە . تاکو تۆم نەناسیبوو تەنها لای ئەم رازی دلم دەردەخستو خەمەکانم وەك کاتی منالیم ئاسان دەکرد ، هەر ئەوەندە بەرامبەری دادەنیشتم بیرەوەرییەکانم لێم دەئالآن لەپەل‌وپۆیان دەخستم ، دەنگمیان بەرەو ناوەوە دەگێرایەوەو لەوێ پەنگی دەخوادەوە» ساتە خۆشەکانم هەرگیز بۆ نەدەگێران ، یارییە خۆشەکانی ناو کۆڵانە خۆلاوییەکەی دێ گەرمیانییەکەم وەك فلیمێکی نە شۆراوە لێڵ‌و ئالۆزو تێژرەو بوون ، ئیتر بینم تیایاندا دەخواردەوە کامیان کزەی لەجگەر هەڵدەسان‌و هەردەی پڕ لە چقل‌بوون یەك لە دوای یەك خۆیان دەدایە دەم یەکترەوە ، زۆر جار دەمویست خۆمیان لێ رزگاربکەم دەمدان بەدەم رووبارێکەوە کەچی خۆمیان هەڵدەلووشی ، دەمویست بیانخەمە ژێر تاشە بەردێکەوە بەلام خۆمم دەدی لەژێریانا دەتلیسامەوە ، لەگەل زدخیرەی مالێکی بناردا گڕم تێ بە رددان کەچی ئەوان منیان دەسووتاند ، دەمدان بەدەم رەشەبایەکی توندەوە وەك وردە ـ کا ـ بە سەرما دەبارینەوە . ئەم تەنهاییو خەون بینیەم لەو رۆژانەوە بۆ ماوەتەوە ئێستەش لە هەموو دەنگ بەرز کردنەوەیەکی کوت‌و پڕ دا دەچەلەکێم .. نەڕەی باوکم هەرگیز لەیاد ناکەم کە بە شولێکی تەرەوە بەسەرمەوە رادەوەستا منیش لە ژێر پێیدا کرمۆڵەم دەکرد .

ـ بەکارچی دێی ، ئەوەمنالانی خەلکیو

ئەمەیش تۆی .

ئیتر خوا خوام بوو قوژبنێك بدۆزمەوە ، لــە منداڵان دوور بکەومەوە ، تا ئێوارەیەکی درەنگ دایکم لەسەر پەرێز دەگەڕایەوە سەری دەخستمە کۆشی ، بۆنی پــەرێزو قرچــەو ئارەقــەی وشــکەوە بووی خەمەکانمی دەکردن بەهەڵم ، کە دەستیشی بە سەرا دەهێنــام ، دەبووە مەرهــەم شمس دەستی باوکمی سارێژ دەکرد. تادایکم مابوو هەموو جەژنێ کراسێکی تازەم دەپۆشی منیش لەگەڵ منالأنی گوندا بەدە ستی چــەورەوە تانیوەرۆیــەکی درەنگ لــەســەر هێلی شـەمەندەفەرەکەو مەزاری شــەخســەکــەی نزیك گوندەکە یاریمان دەکرد . کە جلەکانی لە – خوم ـ نا ( دواجا زانیــم بۆ وای کرد ) و لێوەکانی نشــتنە سەریەك چەژنان لە سەربانی کوختەکەمانەوە دەستم دەکردە چەتر بۆ چاوم‌و لەوێوە دەمڕوانی یە منالأن . . پاش ئەوە وەك نووسینێکی سەر دیوار بەبۆیە رەش کرابێتــەوەو نــەخوێنرێتــەوە هیچی‌وای پاش ئــەو ماوەیەم بیر ناکەوێتەوە بەڵام هەندێکیان وەك تارمایی پشت پەردەیەك بە خەیاڵما گوزەر دەکەن ... دایکم شەوان دەگری لەژێر جاجمەکەوە گوێم لە هەنسکی دەگرت ئاردیش نــەما پورە « نــەخشین » هــەموو رۆژێك نانێکی دەدامی باوکم لە گوندەگە دوور کەوتەوە ئوتومبیل، دایکم ئەپاڕایەوە، بایزی هاورێم خوێن من لە کونێکدا خۆم شــاردەوە گەراینــەوە خانویــەکی تازەمان کرد ... بەڵام ئەو شەوە تۆفەم قەت لەیاد ناچی کە دایکم وەك دار چنارێکی بڕاوە راکشابــوو منیان نزیك کردەوە دەستی کردە ماچ کردنم دەمی هەڵنەبڕی بووە قیژە قیژ ، ئەو شەوە لەماڵی پورم نوستم زۆری پێ‌نەچو ماڵەکەمان پێچایەوە بەڵام من تەنها وێنەکەی دایکم کەپورم لە چوارچێوەیەکی نابوو مەبەستم‌بوو ، لە ژوورێکی گلێنی گــەرەکی شارێکدا گیرساینەوە . هۆگری وێنەکە بوو بووم زۆربەی کاتم بەرامبەری بەســـەر دەبرد ، تادەهــات جلـــە خوماوی‌یەکەی لەبەرچاوم لە چوارچێوەکە گەورەتر دەبوو . بەرە بەرە لەناو ژوورە گلینەکەمانەوە پێـــم کرایەوە بۆ کۆڵان‌و گەرەکەکانی تر ، جیاوازی‌یەکی ئەوتۆم لەگەڵ کۆڵانە خۆڵاوی‌یەکەی گوندەکەمانـــدا نەدەدی . تاکو تەرا پیرەژنە رەش پۆشــەکان کـــە لەبەر دەرگاکاندا ئەژنۆی خۆیانیان لەباوەش دەگرت هەستم کرد وردە وردە پێ‌یان ئاشنا دەبم چونکـــی لەدایکم دەچون کەبەر چوارچێوەکەم بەردەدا ئەمانم دەبینی، لەگەڵ دایکمدا وەك یەك دەمدین ، بەخەیاڵیش دەرگاکانم بۆ دەکردن بە چوارچێوە،بەهەموو کەسێکدا دەیانڕوانی‌و نەیان دەڕوانی‌یە کەسیش ، بە تروسکایی چاوە قوڵەکانیاندا دەردەکەوت چاوەڕێی کەسێکن ، ئەوان کەسی خۆیانیان دەناسن بۆیە بۆ کەسی تر دا نەنەچەلەکان‌و لێویان نەددترازا ، وەك وێنەکەی دایکم بونــە جێگای تەســـەللام ، تادەهات ژمارەیان پتر دەبوو ، بەڵام نەکەس ئاوڕی لێ دەدانەوە نەئەیدوانن ، لە ماڵەوە چوار چێوە کە ، لە کۆڵانەکانیش ئەم نوختە رەشـــانەم دەدی ، هەموو شتێك لەبەر چاوم رەنگی جلەکانیانی گرتبووە خۆ . بـــەڵام کـــە تۆم ناسی « پەری‌خان » لایەنە خۆشەکانی بیرەوەری‌یەکانم وا خەریکن سەرهەڵدەدەن ، پێش ماوەیەك کە دەستت لەناو دەستما ئارامی گرت ، هەستم کـــرد دەستی دایکمەو شمـــی دەستی رۆژگارم سارێژ دەکـــات ، کەسەر دەنێمە سەر سنگت دیمەنە تیژ ڕەوەکـــان هێور دەبنەوەو ، بۆنی باوەشی دایکم وە بیردەخاتەوە کە ئێواران لەسەر پەرێز دەگەڕایەوەو خەمی ئــەو رۆژەم لە باوەشیدا فەرامۆش دەکرد ، کە بۆنی قژت دەکەم ئەو کاتە خۆشانەم وە بیردەخاتەوە کاتێ منال بووم : خۆم رووت دەکردەوە ورگ بەرلووتی لـــێ گرتبووم خــۆم لـــە جۆگــەڵـــە بچکۆڵـــەکـــە هەڵدەکێشا ، لەوێوە هێشتا چۆڕاوگەی ئاو بە تەنما دەهاتە خوارەوە لەسەر خۆڵە داخکراوەکەی رێگاکە رادە کشام بۆنێکی خۆشی هەبوو ، بۆنی قژت ئــەو بۆنەم دێنێتەوەیاد . هەموو بەیەك گـــەیشتنێکت شتێکی تازەم فێر دەکەی چاوەکانت ئــەوەیان دپێ راگەیاندم کە بێچگە لە ڕەنگی جلەکانی‌دایکم رەنگـــی تریش هەیە ، ئەودت لە لام چەسپاندا ( من هەم ئەبێ بەشدای ژیان بکەم ) .. ئەم ئێوارەیە کـــە چەپکـــە گوڵەت داپێم پێت ووتم :

ـ ئەمەیان لە گوڵدانێکـــدا لـــە تـــەنیشت چوارچێوەکەوە دانێ ، سەرو گوڵیش دەدەینە دەست ئەوانی ترەوە. وا هەڵدەسم فەرمانەکەت بەجێ‌دێنم. لەسەر ئەسکە ملی‌یەکـــە هەڵسا گوڵێکی خســـتە گوڵدانەکەوەو لەتەنیشت چوار چێوەکەوە داینـــا . هەستی کرد هەموو شتێکی ئەمرۆ لەدوێنێ ناکات . لەبەر خۆیەوە ووتی «خۆزی زووتر دەتم‌ناسی» لەبەر خۆیەوە کەوتە ووتنەوەی‌ئـــەو گۆرانی‌یـــەی کـــە لادێ‌یەکان ئێواران دەیان ووت .

**طوز – ١٩٧٨**

# جووتە وشە

جلال محمد علی

گەلێك وشە لە کوردیدا پێکەوە دێن ، (و)ی ئامرازی پەیوەندی لە نێوانیاندا ئەبێتو پێکیانەوە ئەبەستێتەوە ئەو جووتە وشانە بە چەند بەشێکەوە ئەکرێن .

**١ ـ ئەو جووتە وشانەی کە یەکێکیان تەنیا بۆ تەواوکردنی ئیقاعی ووشەکەی پێشوو ئەهێنرێت . واتا هاو ئیقاعیەتی .** هەر وشەی یەکەمە بەڵام پیتی یەکەمی ئەکرێتە بە (م) . ئەمەیش وەك وتم تەنها بۆ تەواوکردنی ئیقاعەکەیە کە زمانی کوردی زۆر بە تەنگیەوە هاتووەو دێت ) لە سازاندنی ووشەکانیدا پەیڕەوییەکی باڵای کردووەو ئاوازی مۆسیقی ووشەی هەمیشە پاراستووە .

بۆ نموونەی ئەم جۆرە بڕوانە ئەم جووتە وشانە .

**داروماڕ . سێوومێو . هاڕوماڕ . ڕەشومەش . جووچكومووچك .**

بەم شێوەیە هەر ناوێك یەکەم پیتی (م) نەبێت ئەتوانرێت هاوەڵێکی ئیقاعی بۆ بسازێنرێت.

**٢ ـ ئەو جووتە وشانەی کە هاوواتان . بە ڕای من پێکەوە هێنانیان بۆ چەند ئامانجیکە .** بۆ پاراستنی وشەکەو ئاوازدانێك بە زمانەکەو بە هێزکردنی ئاخاوتنەکە .

یان هاو واتانین بەڵام واتاکانیان لێکەوە نزیکە تەنیا بۆ بە هێزی و بە پێزی واتاکە پێکەوە دێن . ئەمەیش چەند نموونەیەکی هاو واتایە :

پاکوتەمیز . خواروخێچ . فێنجوفیت . پیسوپۆخڵ . جاری واش هەیە یەکێك لەو جووتە وشانە بێگانە ئەبێت وەك : شاخوداخ . چەموچونورد . ساغوسەلیم . سەروەتوسامان . فەقیروهەژار . جووتوفەلاحەت. هەوڵوکۆشش . هاروهاج

**٣ ـ هەندێك وشە لە دوو وشە ئەسازێنرێت هەر وشەی مانایەکی هەیە ، بەڵام بە هەردووکیان واتایەکی تایبەتی دروست ئەکەن وەك :**

**دەستوبرد** : ( دەستی بزواندو بردن هاتە کایەوە . یان دەست کێشانو بردن یەکێك بوو . واتا خێرا )

**دەستبەجێ** : ( دەست بزواندن بەجێهێنان یەك بوو . واتا گورج کارەکە کرا )

**دەمودەست** : ( لە دەم قسە کە هاتە دەرێو دەست کەوتە کار ).

مانای ئەم جۆرە جووتەوشەیە پەیوەندییان بە مانای هەردوو ووشەکەوە هەیەو لەمانای هەردووکیان مانا تازەکە هەڵئەهێنجرێت

**٤ ـ هەندێك جووتە وشە دێن پێچەوانەی یەکن وەك . ساردوگەرم .**

**٥ ـ ئەو جووتە ووشانەی کە وتەی جێگرن (ئیدیۆمن) ، دکتۆر عبدالرحمن لە کتێبەکەیدا (ووشەی زمانی کوردی) بە ناوی فرێزی تێکچرژاو ناوی بردوون و ئەڵێت « ئەوانەی کە مانای گشتییان بەهیچ جۆرێك بەند نییە بە مانای ئەو ووشانەوە کە فرێزەکەیان پێکهێناوە »و (گوڵومۆڵ)ی بە نموونەهێناوەتەوە ئەڵێت مۆڵ بەتەنیا مانای نییە . بەڵام مۆڵ مانای هەیە (گرد ، یان کۆ) ئەگەیەنێت ئەڵێن ڕانەکەی مۆلی خوارد یانمۆڵ بوو . واتا کۆبۆتەوە .**

لەگەڵ ئەوەشدا ڕاستە بەشێکە لە فرێزەکە بە ڕای من لەبەر ئەوە نەبوون بە ووتەی جێگر کە یەکێکیان مانای نییە بەڵکو لەبەر ئەوەی بە هەردووکیان واتایەکی ( مجازی ) جیا لەواتای هەردووکیان دروستئەکەن . مانایەکی فراوانی جیا وشەیەکی قووڵی تصویری پێکدەهێنن . بۆ نموونە (چاووڕاو)ی لێئەکات واتا فێڵی لێئەکات . یان (پێچوپەنا) . ئاشکرایە کە پێچی ڕێی کێو کە شێوو هەڵەت ئەبڕێت یان توون توونی کێوەکە ئەبڕێت ، هەموو پێچێك پەنای تێئەکەوێت کە دۆڵو شێوەکەیەو بەمە واتایەکی تصویری دروست ئەبێت ئەڵێت بە پێچوپەنایە . واتا ڕاست نییەو فێڵبازە .

بە ڕای من بەم شێوەیە ئەتوانرێت مانای هەموو جووتە وشەیەك بدۆزرێتەوەو ببرێتەوە سەر بنچینەکەیانو ئەو بیرەی کە بۆی پێکهێنراون .

لە ناو ئەم جووتە وشانەدا ئەو جووتە وشانەی کە بۆ دەنگ هاتوون وشەی هووڕیان هەموو لەگەڵدایە وەك :

**خرنگوهووڕ . خوڕوهووڕ . خیزوهووڕ . خشپوهووڕ . خشوهووڕ خرموهووڕ .**

**خـرتوهـووڕ . گـرموهـووڕ . نرموهـووڕ . تـەقوهـووڕ . شـەقوهـووڕ . فیـقوهووڕ . جیقوهـووڕ . جـرتوهـووڕ . فـرتوهـووڕ . فلقوهـووڕ . فیـسكوهووڕ . فـشوهـووڕ . قـرموهووڕ . قـرتوهـووڕ . كـرموهـووڕ . مرقوهـووڕ . مشوهووڕ .**

دۆزینـەوەی مانـای دوو پارچەكـەی فرێـزی تێكچرژاو پێویستی بـە لێكۆلینەوەیەكی زۆر هەیەو بەراوردكردن لە گەڵ زمانە كۆنـەكانی ئێـرانو ئاوێـستاو هندوئەوروپیـدا تا بزانرێت واتای ئەو جووتـە پارچـەیـە چیـیـە . ئاشكرایشـە وشـە مردووەكانیش ئەگەر سەرچاوەی تەواو هەبێتو سـۆراغی بنچینـەیان بكرێـت واتاكانیان هەر ئەدۆزرێتەوە .

**وا لـە خوارێشەوە ئـەم جووتـە وشانەتان بەپێی پیت پێشـكەش ئەكەم لە ناویانـدا بـەشی زۆری جۆرەكانی تێدایە**

**ا**

ئاینوئۆین
ئیسكوپرووسك
ئاڵوگۆڕ
ئاڵووالا
ئاشناوڕوشنا
ئاشوماش

**ب**

باریكوبنێسی
باسوخواس
باقوبریق
بریقوهووڕ
بڕوبیانوو
بەیتوبالۆرە

**پ**

پەلوپۆ
بڕوپیت
بڕوبیرێژن
پاوپووز
پێوپووز
پانوپۆڕ
پووشوپەلاش
پەناوپەسێو
پەناوپەسێر
پێوپل
پێچوپلووچ
پشتوپەنا
پینەوپەڕۆ
پۆشتەوپەرداخ
پژموغار

**ت**

تارومار
تاریكوتوونەك(تنۆك)
تاكوتووك
تاكوتەرا
تاكولۆ
تەكولۆ
تاوتوو
ترشوتاڵ
تڕوزڕ
تڕوفیز
تەفروتوونا
تەپوتۆ
تەپومژ
تەپوتل
تەپوكۆ
تەپونم
تەقوتۆق
تەنكوتیواڵ
توندوتیژ
تەنگوچەڵمە
تەپودۆڵ
تەپوگل
تەپوهوور
تەپودووكەڵ
تەپوتۆز
تەڕوتازە
تەڕوتفاق
تەڕوتووش
تەسكوترووسك
تێكەڵوپێكەڵ
تێكوپێك
تیروپڕ
تیروتەسەڵ
تكوتاس
تیسكوتروسك
تووڕەوتڕۆ
تەنكوتیواڵ
توندوتۆڵ
تیروتوانج
تاوتوو
تاقولۆق
تاكولۆك
تاسولووس
تاسەوئارەزوو
تاووتۆق
تاوتوان
تەمومژ
تریقوهووڕ
ترپوهووڕ
ترسولەرز
تەقەوڕەتە
تانوپۆ
تەختوتاراج

**ج**

جرتوفرت
جوستوجۆ
جیڕوڕێ
جرنیاوفرنیا

**چ**

چەپوچیر
چاووڕاو
چەكوچر
چاڵوچۆڵ

## خ

خاڵوبۆر
خاڵومل
خانومان
خانوبەرە
خاتروخۆتر
خاووخێزان
خایەومایە
خەڵكوخوا
خەریكوخەركاو
خەرتوپەرت
خرتوپرت
خەتوخاڵ
خواروخێچ
خێڵوخوار
خێروبێر
خێروبەرەكەت
خاووخلیچك
خنجوخۆڵ
خرنگوهووڕ
خشبوهووڕ
خرموهووڕ
خڕوهووڕ
خرتوهووڕ
خوروهووڕ
خوتوخۆڕایی
خوتەوبۆڵە

## د

درۆودەلەسە
دەموفلچ
دێوودرنج
داروپەردوو

## ر

ڕاستوڕەوان
ڕاووڕووت
راووشكار
رازوگلەیی
رەنگوبۆ
ڕەپوڕاست
ڕەقوتەق
ڕشكوپێشكەت
ڕەشوڕووت
رەختوشەقەبەند
رێوبان
رێوشوێن
رێكوپێك
ریقوفیق
ڕووتوقووت
ڕووتورەجاڵ
رەنگورِوو
زرموهووڕ
زرموكوت
زریكوهووڕ
زڕوهووڕ
زەردوزۆڵ
زڕوزەنگیانە
زەنگوقۆڕ
زیڕوهووڕ
زرنگوزیت
زالوزیك
زاقوزیق
زاوزێ
زەبروزەنگ
زەویوزار

## س

سەروپۆتەلاك
ساغوسەلیم
ساردوسڕ
سەڵتوقوڵت
سەنگورەنگ
سەروبن
سەروچاو
سەروگویلاك
سەروروو
سەروسڕ
سەروپێچ
سەروسامان
سەروسیما
سەروسەختی
سفتوسۆڵ
سیلودیق
سەروشوێن
سینیوخوان
سەرماوسۆڵە
سووكوترۆ
ساروماو
سازوسەما
سۆرەونۆرە

## ش

شەلوپەت
شەنگوشۆخ
شەڕوگەڕ
شلقوهوور
شینوشەپۆڕ
شەقوپەق
شەقوشۆق
شەقوهووڕ
شەڕوشۆڕ
شێتوشەیدا
شێتوویت
شلومل
شلوشێواو
شلوشۆڕ
شلقوهووڕ
شڕودڕ
شڕوبڕ
شاتوشووت
شڕوپڕە
شڕوشیتاڵ
شلپوهووڕ
شاخوداخ
شاییولوغان
شەلوگیر
شەپوشۆڕ
شتومەك

## ف . ف

فێڵوفەرەج
فرتوهووڕ
فڕكوهوور
فروفێڵ

فەنگ‌و فێل
فێڵ‌وتەڵەکە
فیشلک‌وهوڕ
فیک‌وهوڕ
فلق‌وهوڕ
فاك‌و فیك
ڤروهوڕ
ڤنگ‌وهوڕ
ڤزوهوڕ

**ـ ع‌غ ـ**

عەلەوجەلە
غەزوبەز

**ق**

قڕوبڕە
قڕوهوڕ
قرم‌وهوڕ
قنج‌وقیت
قاووقیژ
قیزوبیز
قەوم‌وقیلە
قرچ‌وهوڕ (کرچ‌وهوڕ)
قیژوهوڕ
قەرزوقۆلە
قلپ‌وهوڕ
قوروچلپاو
قووروقەپ

**ك**

کش‌ومات
کفت‌وکۆ
کنگەوتلوور
کوت‌وکوێر
کوت‌ومت
کێشەوبەرە
کاڵ‌وکرچ
کردوکۆش
کول‌وکۆ
کورت‌وکۆڵ
کەم‌وکووڕی
کوت‌وبڕ
کەل‌وپەل

کەس‌وکار
کەرت‌وپەرت
کەش‌وفش
کەین‌وبەین
کشت‌وکاڵ
کون‌وکەلێن
کون‌وکەلەبەر
کون‌وقوژبن

**ـ گ ـ**

گێژووێژ
گژوگیا
گریف‌وزار
گریشمەوناز
گرم‌وهوڕ
گڕوفڕ
گڕوپف
گڕوکف
گڕوگاڵ
کورج‌وکۆڵ
گڕوهوڕ
گڕوهوڕ
گاڵتەوگەپ
گێزوگوڵنك
گەردولوول
گل‌وتل

**ل**

لاف‌وگەزاف
لات‌ولەوار (لێوار)
لارولەنجە
لەت‌وپەت
لچ‌ولێو
لق‌وپۆپ
لێنج‌وفینج
لەق‌ولۆق
لووس‌وپووس
لات‌ولووت

**م**

مل‌وموش
مڕوموش
ماچ‌وموچ

سەرزوبووم
مشت‌وماڵ
مشت‌ومڕ

**ن**

نازونووز
نازونیاز
نەرم‌ونیان
نەرم‌وشل
نەرم‌ونۆڵ
نەخش‌ونیگار
نفت‌ونوێ
نازوجیار

**ه**

هەرچی‌وپەرچی
هەڕدشەوگوڕەشە
هەڕەوگوڕە
هاش‌وهووش
هاشەوهووشە
هەراوهوریا
هەڵەشەوپەلەشە
هەراوزەنا
هەیت‌وهووت
هەوڵ‌وتەقەلا

## سەرچاوەکان


١ ـ ووشەی زمانی کوردی
د عبد الرحمن حاجی مارف
٢ ـ فەرهەنگی مەردۆخ ج١ و ٢
٣ ـ فەرهەنگەکەی مامۆستا
زەبیحی ج١
٤ ـ فەرهەنگی خاڵ ج١ و ٢ و ٣
٥ ـ فەرهەنگەکەی مامۆستا
توفیق وهبی‌و ئەدمۆنس
٦ ـ ئەستێرە گەشە فاضل
شیخ نظام الدین
٧ ـ ڕابەر ـ گیو موکریانی ـ



# با نەخوێندەوارێك لە وڵاتەكەمانا نەمێنێ

وڵاتەكەمان لە ماوەی سالی خوێندنی [ ١٩٧٨ ـ ١٩٧٩ ] دا گەورەترین بزوتنەوەی رۆشنبیری‌و كۆمەلایەتی‌و شارستانێتی بە خۆیەوە دی .. بۆ پاككردنی هەموو شوێنەوارێكی نەزانی‌و پاشكەوتنی لە پێناوی بنیاتنانی كۆمەلێكی شارستانی پێشكەوتوودا ، لە ماودی جێبەجێ ـ گەباندنی خوێندنی تەوزیمی‌و بەجێهێنانی یاسای هەولدانی نیشتمانی تەواو لە پێناوی قەلاچۆكردنو نەهێشتنی نەخوێندەواریدا .. بە شێوەو ئوسلوبی نوێ كە نەخشەی ئەم قەلاچۆكردنە پشت بە كردارە بنچینەیەكانی قەلاچۆكردنە كە ئەبەستێ .. وە هەولی ئەوە ئەدا كە هاوولاتیەكان باوەریان بە خۆیان بەهێز تربێ‌و باشتر لە ماناو ناوەرۆكی هەموو بابەتە نیشتمانیەكان‌و رێبازی سۆشیالیستی‌و مرۆڤایەتی بگەن لە بواری كاركردنی رۆژانەیاندا .. وە لە رووكاری دواكەوتن‌و چاولێكەری‌و هەموو ئەو هۆیە كۆنانە دووربكەونەوە. كە لەگەل قۆناغەكانی گۆرانكاری مرۆڤی ئەم سەردەمەو پێشكەوتنە تیژرەوەكەیا ناگونجێن ..

**پێویستە نەخوێندەوارێك لە سەرانسەری وڵاتەكەمان نەمێنێتەوە كە ئەمە یەكێكە لە دروشمەكانی شۆرشو ئەو نەخۆشیەی كە چەندان سالە چووەتە ناو لەشی كۆمەلەكەمانەوە وئیمپریالیزمو هاوكارەكانی‌و ئەوانەی هەولیان داوە كە كۆمەل لە هەموو روێكی پێشكەوتن دووربخەنەوەو سوودی لێوەرئەگرن .. ئەبێ لە ریشەوە هەلبكەندرێ .. ئینجالەبەر ئەم ئیعتباراتانە بریارە مێژوویەكەی نەهێشتنی نەخوێندەواری هاتەكایەوە .**

هەروەها هەموو پێداویستیەكانی ئەم هەولدانە نیشتمانیە لە بارەی نەهێشتنی نەخوێندەواریەوەو لە هەموو ناوچەیەكی وولاتەكەمانا جێبەجێكرا .

وە لەوانەش ناوچەی ئۆتۆنۆمی ، وە ئەو پیاوە بە تەمەنانەی كە چوونەتە سالەوە بە پێی ئارەزووی خۆیانە وە بە كوردی بخوێنن یان بە عەرەبی .

زمارەی نەخوێندەوارەكان لە ناوچەی ئۆتۆنۆمیدا [ ٤٠٧ ] هەزارو ٣٢٩ كەس بوون لە هەر سێ پارێزگاكانی سلیمانی‌و هەولێرو دهۆكدا وە لە كاتی دەرچوونی یاسای هەولدانی نیشتمانی‌یەوە لە بارەی قەلاچۆكردنی نەخوێندەواریەوە خۆ ئامادەكردنی فراوان لە ناو خەلكا دەرئەكەوێ بۆ بەپیردوە چوونی ئەم كارە نیشتمانیە ..

هەر وەكو رۆژبە رۆژ پێداویستەكانیان جێبەجێ ئەكرێ ..

لە پارێزگاو قەزاكانا لیژنەی لق بۆ جێبەجێهێنانی یاساكە دروست بووە .. وە بۆ ئەم مەبەستە قوتابخانەی نوێ كراوەتەوەو ئەو قوتابخانانەش كە بچووك بوون فراوان كراونەوە مامۆستایان بە تازەترین شێودی دەرس ووتنەوە فێری وانەووتنەوە كراون‌و دەورەی فێركرنی تایبەتیان بۆ كراوەتەوە .. ئەمانە جگە لەو سیمینارە جەماوەریانەی كە مەبەستی سەرەكی ئەو هەولدانەی تیا باسی كراوەو خەلكەكە لە ئەنجامی ئەم پێ خوێندنە تێگەیەندرا وون‌و هاندراون كە بە توانایەكی هۆشیارانەوە یارمەتی كاربەدەستانی دەولەت بدەن بۆ ئەوەی بە باشترین شێوە سەربكرێ‌و مەبەستە بنچینەییەكەی بێتەدی . هەروەها لە هەموو پارێزگاكاندا لیژنەی تایبەتی پێكهێنراون كە بە سەردان ئەچن بۆ لادێكان‌و لەگەل خەلكا كۆ ئەبنەوەو باسی دەوری كاریگەری خەلكەكە ئەكەن لە بواری جێبەجێكردنی ئەم هەنگاوە مەزنەدا ..

■ گەلاوێژ علی عزیز ■


رقم الإيداع في المكتبة الوطنية ببغداد ١١٨١ لسنة ١٩٧٨

## بیروڕای سەربەست

### شـیعر ...
### جوانی و خۆشەویستیو
### خاك و مرۆڤ

● ئەوەتەی هەڵسو کەوت لەگەڵ ئەو جۆرە وشەیەدا دەکـەم ، تەزوویەکی بەلەزەت هەنـدێ جارو ... ، تەزوویەکی پڕ خـەمو ژان ، هـەندێ جاری تر دەدا بەگیـانو .. ، تێڕامانێکی قوڵـی مرۆڤایەتی دروست دەکا ، لە هەردوو ساتی لەزەتو خەمـدا پێی دەوتـرێ «شـیعر» ، لەوسـاوە ، واتێگەیشـتوم ، «شیعر» لەپاڵ ئەو تـەزوە بـە ئاوازەدا ، دەربڕی ناخەو دروست بوونی وێنەیەکی جوانی هونەری‌یە ، مرۆڤ لـەخزمەتی تـەزووی ناخـی مرۆڤـدا ، دەیخـاتـە تابلۆیـەکـی رازاوەو ... ، ئـەوەی ناخـی خـۆی تێـدا دەبینێ ، چەنـد لەشـاعیر دوور بێ ، خۆیی تیـدا دەبینێ ، لەوساشەوە ، واتێگەیشتوم ، «شیعر» .. جوانیەو .. خۆشەویستیو .. خاكو مرۆڤ ، جوانیو خۆشەویستیو خاکیش ، کۆڵەکـەکانی بەردەوامی توانای مرۆڤن ، بۆیە ، بەلای‌منەوە ، ئەرکی شـیعر تەنیا تەزوویەکی راگوزار نیە ، بەڵکو تەزوویەکە ، رەگ دادەکوتـێ ، رەگ دادەکوتێ ، کاتـێ ، ماوە دەدا ، بەتێڕامانو ورد بوونەوە ، قوڵ دەبێتەوە ، نەك تەنیا بۆماوەی دانیشتنێکی تایبەتی ، بەڵکو ، سەرەتایە ، بۆ بەردەوامی ، بەردەوامی وشەی بە ئاوازی جوانیو خۆشەویستی ، قوڵ دەبێتەوە ، بۆ خاكو ناخـی مرۆڤ ، لەو قوڵیەوە ، سـەر دەردەکا ، لەگـەڵ تێڕامانی مرۆڤو شتەکانیا ، پێدەگاو گەورە دەبێ .

● مرۆڤو خۆشەویسـتیو ، جوانیو خاكو ئاوازی خەم ، یان لەزەتی خۆشی ، تەزووی نەمریو بەردەوامیە ، ... نەك «چەپڵەیەك»و ساتێك .

.. «شیعر» ، هەتا نوێ ببێتەوە ، زیاتر لـەم راستی‌یەدا .. قوڵ دەبێتەوە ..

● من .. وا لە «شیعر» دەگەم .

**عبدالله عباس**

نرخی ٥٠ فلسە

ئەم ژمارەیە ٨٠٠٠ دانەی‌لێ چاپکراوە

مطابع واوفسيت الزمان

ROSHINBIRY NWE
General Monthly Magazine
Issued by : The Kurdish House For Culture and Publishing
Ministry of Culture and Arts
Baghdad — Iraq

روشنبیری نوی
مجلة شهرية عامة
تصدر عن : دار الثقافة والنشر الكردية
وزارة الثقافة والفنون
بغـــداد

